د. کوردۆ عەلی



# سۆڤیەت و بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد

## هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەیەکی رەخنەگرانە بەکارنامەی دوکتۆراکەی کاک (فازل رەسول) دا

چاپی دووەم

د. کوردۆ عەلی

# سۆڤیەت و
# بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد

هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەیەکی ڕەخنەگرانە
بەکارنامەی دوکتۆراکەی کاک ( فازڵ ڕەسوڵ ) دا

چاپی دووهەم
٢٠٠٩

# پێرست

## پێشەکی:

( میللەتانی زۆرلێکراو و بێدەرەتان، پەلاماری هەردەستێك دەدەن کە بەنیازی دۆستایەتی بۆیان درێژکرێت، ئێمە ئەو دەستە تەنها ناگوشین، بەڵکە ماچیشی دەکەین ).

پێشەوای شەهید قازی محەمەد لەکاتی سەردانەکەی باکۆی لە پایزی ١٩٤٥ دا، ئاوها ڕاستگۆیانە و بێپەردە و تامەزرۆ لە بەرامبەر باقرۆف دا دێتە وەرام. ئەو گوتانەی کە تك تك ئاوات و ئازاریان لێدەچۆڕێت، پێموایە گوزارە لە هۆش و هەست و ویژدانی گشت کوردێکی بەشەرەفی بەتەنگەوەهاتووی مەسەلەی میللەتە ستەمدیدەکەی دەکات.

میللەتانی مافخوراو و پێشێلکراو، تایبەت میللەتێکی گەلەکۆمەلێکراوی وەك کورد، لەگشت لایەك زێتر چاولەدوو و ئاواتەخوازی دۆستایەتی ڕاستەقینەن. تایبەت گەر ئەو دۆستە بەپێی بانگاشە و گوتەی ئاڵ و والای نێو کتێبە ئەستوورە دەق نەشکاوەکان بێت، هێزێکی پێشکەوتنخواز و پشتگیریکەری گەلانی چەوساوە و ژێردەستە بێت، هاوسێیەکی بەدەستەلات و بەتوانای کورد بێت. ئاشکراشە ئەرکی ڕاگرتنی دۆستایەتی، کەمتر بە گەلانی

بێهێزو لارەملی ئەو دۆستایەتییە هەڵدەستێت، گەلەکجار دەبێتە لۆقەکردن بەدووی سەبوون و سەراب دا.

بریا و سەد خۆزیا سۆڤیەت دۆستی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی میللەتەکەمان با، دۆستێکی ڕاستەقینە و تاسەریش با، داخۆ لەمێژ نەبوو میللەتەکەمان لەخەم ڕەخسیبوو؟ لێ کورد جوانی فەرمووە: (داری بریا بێبەرە).

بە بڕوای من، لەمپەڕی دوژمنایەتی گرتن لە شوورەوی چەند هەڵەیەکی کوشندەیە، زێدەڕەوی و سنگکوتانی خۆڕایی و دووی تراویلکە کەوتنی ئەو دۆستاییەتیەش، سەکتەیەکی هێندە زیانبەخشە لە بزووتنەوەکە دەدرێت. بۆیە پێویستە گشت ڕووداوێک و هەڵوێست و پێشهاتێك بە پێوانەی واقیع کێشانەکرێت و مامەڵەی لەگەڵ کرێت.

ئەوانەی پێیانوایە زلهێزێکی وەك سۆڤیەت، بە بەیاننامەیەك، یاخود بەپێداهەلگوتنی گوتارێکی سادە و ساکار، دەستبەرداری گشت بەرژەوەندیەکانی دەبێت و لە پیلی کورد دەنەوێت و بە پەرێژی ئازادییدا دەکات ، هێندە لەسیاسەتدا سافیلکە و نابینا و ناکامڵن، کە ئومێدی چاوکردنەوەیان لێناکرێت. ئێمە قەت و قەت نالێین سۆڤیەت دوژمنی کوردە، بەلاّم پێمانوایە دۆستی یەکەمی بەرژەوەندییەکانی خۆیەتی و گەلەکجار هەڵپەی مسۆگەرکردنی ئەو بەرژەوەندییانە، هەڵوێستی وای پێوەبەردەگرێت کە لە دۆستایەتی دابشۆردرێت و سەربەخانەی دوژمنایەتیدا شۆڕکاتەوە. خۆدەبێت سنوورێك لەنێوان دۆستایەتی و دوژمنایەتیدا هەبێت، ئایا چۆن

جوداوازیی لە نێوان (دۆستایەتی) ئەوکۆمەك و پشتگیرییانەدا بکەین کە سۆڤیەت و وولاتانی پەیمانی وارشۆ لە ١٩٧٢ەوە بەڕژێمی بەعسی ڕەگەزپەرستی عێراقیان دەکرد، لەگەڵ (دوژمنایەتی) ئەو پشتگیرییانەی ئیمپریالیزمی ئەمریکی و وولاتانی پەیمانی ناتۆ بە ڕژێمە خوێنڕێژەکانی ئێران و تورکیایان دەکرد؟ ئەی خودانەکردە گەر عێراق پشتی تێنەکردبان و تا ئێستاش ئەو ڕووە دۆستانە درۆیەی هەر نیشاندابان؟

هەندەك سافیلکە و بێویژدان کە زۆریان بۆدەهێنیت، سووك و ئاسان دەڵێن: ئاخر دەبێت بەرژەوەندیی وولاتێکی وەکی سۆڤیەتیش تێبخوێنیتەوە. ئێمە بایی پێویست لە بەرژەوەندیی وولاتان تێدەگەین، بەلام کە هەڵچنینی ئەو بەرژەوەندییانە لەسەر حسێبی میللەتانی دی تەواو بوو، کە لەپێناویدا گشت داب و نەریت و یاسایەك ژێرپێ خرا، ئیدی سنوور لەنێوان دۆستایەتی و دوژمنایەتی، چاکە و خراپەدا نامێنێت. کە بەرژەوەندیی پەرستن تا ئەو ڕادەیە ڕەوابێت، کەواتە مافی گلەیی و گازندەمان لە وولاتانی ئیمپریالیزمیش نامێنێت، ئەوانیش لە پێناوی بەرژەوەندییە گلاوەکانی خۆیاندا گشت ڕێگەیەکی ئەهریمەنانە وەبەر دەگرن.

کەواتە دۆستایەتی ووشەی سیسەڵە و بێگیانی سەر پەڕە کۆن و سوورە دەق نەشکاوەکان نییە. دۆستایەتی مامەڵەیە، هەستە، هەڵوێستە، ڕەفتارە، کردارە.

ئەم نامیلکەیەی لەبەر دەستتدایە، پێشچاوخستنی بەشێکە لەو لێکۆڵینەوە زانستانەیەی کاك فازڵ ڕەسوڵ، دەربارەی ئەو لایەنە زۆر گرنگەی بزووتنەوەی کوردایەتی نووسیویە، کە بە بڕوای من شاکارێکی کەم وێنەیە و نووسەرەکەی

دەستپێشخەرێکی کارامە و جەربەزەی ئەو مەیدانەیە. سەرکەوتنی کارنامەکەی کاک فازڵ تەنها لە بۆچوون و هەڵشێلانە زانستانەکەیەوە تێناڕواندرێت، بەڵکە لەو ئازادییە ئەدەبییەشەوە کە لەم بارە شێواو و گێژاوەی سیاسەتی کورد دا، ژیرانە خۆی لەقەرەی باسێکی ئاوها داوە و لێهاتووانە گشت جەمسەرێکی مەسەلەکەی توێژیوەتەوە و هەڵیتەکاندوون و هەڵیسەنگاندوون.

هەر ئەو بایەخ و گرنگییەی مەسەلەکە و ئەو سەرکەوتوویەی کارنامەکەی کاک فازڵ، منی هاندا بەم نامیلکەیە پێیدا بچمەوە و شەن و کەوێکی بۆ خوێنەری کورد بکەم. ئەز لەم ئەرکەمدا سێ مەبەستم پێشچاو گرتووە:

١- ناساندنی ئەم شاکارە بەخوێنەری کورد و پێشکەشکردنی چەند باقەیەك تا خوێنەر بەبەرهەمەکە ئاشنا بێت.

٢- بەرچاوخستنی هەندەك باری سەرنجی جوداواز لەبرێك مەسەلەدا ، کە کاک فازڵ شیکردوونەوە و توێژیوینیەوە.

٣- ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەك کە لەخوێندنەوەی ئەم شاکارەدابەرچاوم کەوتوون و هەستم پێکردوون، کە بەبڕوای من بە هیچ جۆر لە نرخ و بایەخی ئەو ئەرکە مەزنە سەرکوتووانەیەی کەمناکەنەوە.

سەرەتا کە کارنامەکەم خوێندەوە، هەندە تێبینییەکم تۆمارکرد، بەو نیازەی پاشان پێدابچمەوە و پاکنووسی بکەم و گوتارێکی بۆ گۆڤارێك لێپوختە بکەم. بەنامەیەك دەستخۆشی و پیرۆزباییم لە کاکی نووسەر کرد و لەو بارەوە ئاگادارم کرد و ئامادەیی خۆشم بۆ گشت کۆمەکێك دەربڕی، گەر لەپاشەڕۆژدا

کارنامەکەی بکاتە کوردی، چونکە پێموایە کردنە کوردیی ئەو شاکارە ئەرکێکی هێجگار پێویست و پیرۆزە.

کاك فازڵ شادیی خۆی دەربڕی کە بەچاوی ڕەخنەوە کارکەییم خوێندۆتەوە و داوای لێکردم پاشان وێنەیەکی ئەو گوتارەی بۆ بنێرم.

کاتێك دەستم پەرژا و بە تێبینییەکانمدا چوومەوە و جارێکی دی بەووردی کارەکەم خوێندەوە، دیتم گوتارێك لەوێزەی نایەت و ئەو ئەرکەی پێهەڵناسوورێت، بۆیە بڕیارم دا هێندەی لەتوانامدا بێت و مەودا هەبێت بەدوویدا بچم و درێژی بکەمەوە و بەشێوەی نامیلکەیەك پێشکەشی خوێنەرانی کوردی بکەم.

دەبێت ئەوەش ئاشکراکەم کە گەلەکجار لە ڕاگوێزانی باقە و شاچەپکی نووسینەکانی کاك فازڵ دا، تەواوتەواو خۆم بەدەقە ئاڵەمانییەکەوە نەبەستۆتەوە، بەڵکە هەوڵمداوە واتاکەی وەربگرم و بەپێی چێژی کوردیی دایڕێژمەوە و جوانکارییەك لەنووسینەکەدا بکەم. بۆیە ڕەنگە دارشتن و دەربڕینی وای تێدا هەبێت، کە کاك فازڵ دەقاودەق ئەوەی نەگوتبێت، بەڵکە من بەسەلیقەی خۆم دامڕشتۆتەوە. ئومێد دەکەم کاك فازڵ و خوێنەرانی بەڕێز لەو ڕووەوە بمبەخشن.

ماوەتەوە ئەوەی بڵێم کارنامەکەی لە هاوینی ١٩٨٥ دا لە زانستگەی ڤیەننا پێشکەشکراوە، تێکڕا ٤٠٧ لاپەڕەی قەوارە گەورەی گرتۆتەوە، بەسەر ١٠ بەند دا بەشکراوە، کەمن لەبەرەوە بەخەتی درشت سەردێڕی هەربەندێکم بەکوردی نووسیوە.

بۆ ئەم کارنامەیە سوودی لە سەدان سەرچاوە وەرگرتووە و لەپاشکۆدا لیستەی سەرچاوەکانی تۆمارکردووە و پاشانیش شەش بەڵگەنامەی مێژوویی و نەخشەیەکی کوردستانی خستۆتەسەر.

جارێکی دی لەدڵەوە پیرۆزبایی لە کاک فازڵ دەکەم و ئومێد دەکەم ئەمە دوابەرهەمی نەبێت و بە دەیان شاکاری دیکە چاومان ڕۆشنکاتەوە.

سەرکەوتنی گشت لایەك و سەرفرازیی کورد بە ئاوات دەخوازم.

**کوردۆ**

**سالزبورگ، سێپتەمبەری ١٩٨٦**

## سەرەتایەك بۆ باسەكە:

" هەڵبژاردنی ئەم باسە بۆ کارنامەی دوکتۆراکەم، بڕیارێکی دژوار بوو، چونکە بابەتێکە زەحمەتە تا ئێستا بەم شێوازە لێیکۆڵرابێتەوە، جگەلەوەی بارە سیاسییەکەش توێژینەوەی بابەتەکە گرانتر دەکات. کە کەم خۆلەقەرەی ئەم باسە دراوە، وەنەبێت لەبەر کەم بایەخیی بێت، گرنگییەکەی لەوەدایە کە بەشێك لەمێژووی سیاسی نوێی کورد شیدەکاتەوە و وەکو هۆکارێکی گرنگ لە کێشە مەڵبەندییەکان و پێوەندییە سیاسییەکانی ناوچەی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستدا هەڵیدەسەنگێنێت".

کاکە فازڵ یەکەم دێڕەکانی سەرەتای کارنامەکەی بەم کۆپلە پڕلە ڕاستییە دڵتەزێنە دەستپێدەکات. لایەنێکی ئاوها گرنگی مێژووی سیاسی نوێی کورد بە فەرامۆشی سپێردراوە و هیچ بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدراوە. ئەوەی دەربارەی نوسراوە، ئەو بەیاننامە و گوتارە هەرزە و ساکارانەن، کە لەسەر ڕوویەڕی ڕۆژنامە و گۆڤار و بلاوکراوەکانی حیزب و ڕێکخراوە کوردستانییەکان و کۆمۆنیستەکانی ناوچەکە بەرچاومان دەکەون، سەرپاکی هەرە زۆریان، نووسینی پڕوپاگەندەیی بێبەها و بێنرخن، هەڵسەنگاندنێکی گێلانەی یەکلانەی بێپەروا و دوور لە ڕاستین، شاباش و پێداهەڵدانی پڕ درۆ و سەرپێیین،

تـا پاسپۆرتی پێشکەوتنخوازییەکی ساختەیان پێبدرێت. زۆربەی هەرە زۆریـان نرخی ئەو کاغەزەیان نییە کە تێیدا بەخەساردراون.

پاشـان نووسـەر دێتەسـەر سـەرژمێری کـورد و دەنووسێت: "گـەلی کـورد کـە نێزیکـەی پـازدە ملوێنێـك دەبێـت، گـەورەترین میللـەتی بـێ دەوڵـەتی جیهـان پێکـدەهێنێت. هەرچـەندە پەیمانـە نێودەوڵەتییـەکانی پـاش یەکـەم جـەنگی جیهانیی هیوای دەوڵەتێکیان بەکورد بەخشی، بەڵام کێشەکەهەر بێ چارەسەر مایەوە".

بەبۆچوونی من، پازدە ملوێن بۆ ساڵی ١٩٨٥، لەچاو سەرژمێرەکانی بەر لـە خۆیدا، ژمارەیـەکی کەمـە. هەر بۆ نموونـە نووسـەر خـۆی لـە ڕوونکردنـەوەی ئـەو سەرژمێرەدا، بە پەراوێزی ژمـارە (١)، کە لـە لاپـەڕە ١٣ دا ڕوونیدەکاتەوە، چەند سـەرژمێرێکی پـێش خـۆی دەستنیـشانکردووە، کـە پێدەچـێت نێوکـۆیی ئـەو ژمارانـەی بەدەستەوەگرتبێت. دێرینترینیـان سـەرژمێرەکەی لازاریڤـە کـە ١٩٦٣ ژمارەی کوردی بە ٢٠ ملوێن خەملاندووە. نوێترینیـان سـەرژمێری ئینیـستوتێکی ئینگلیزییـە کـە لـە ١٩٨٠ دا ژمـارەی کـوردی بـە ١٧،٢٠٠ ملـوێن قـسراندووە. کـەمترینیان سـەرژمێرەکەی قاسملۆیـە کـە لـە ١٩٦٨ دا کـوردی بـە ١٢ ملـوێن قەبلاندووە.

لێـرەدا بەپێویـستی دەزانم بەشێك لـەو ڕایـەی خـۆم لـە تەرجەمـەی کـوردیی (کوردستـان و شۆڕشەکەی) دەوە بۆ خوێنەر ڕاگوێزم کەلەمەڕ ئەم مەسەلەیە لـە پەراوێزی ل١ دا دەرمبڕیوە: (بەپێی یاسایەکی دێمۆگرافیی، نەتـەوەکان هەر بـە بیـست سـاڵ، ژمارەیـان دەبێتـە دووقـاتی خـۆی. بەوپێیـە گـەر کـەمترین ژمـارەی

کورد لە بیستەکاندا وەرگرین، ناشێت لە پێنج ملوێن کەمتر بووبێت. ئەوەتا پارتی خۆیبوون لە کۆتایی ١٩٢٠ دا، نامیلکەیەك بلاودەکاتەوە، لەو نامیلکەیەدا سەرجەم ژمارەی کورد بە ٥.٤ ملوێن دانراوە، کەژمارەیەکە عەقڵ قبووڵی دەکات. کەواتە بەپێی ئەو یاسایەی باسمانکرد، بەلای کەمەوە ژمارەی کورد لە حەفتاکاندا لە ٢٠ ملوێن تێپەڕ دەکات. (١)

ئەوجا نووسەر دەگەڕێتەوە سەر ئەو ڕاستییەی کە ئەم باسە هێشتا بەم فراوانییە لێینەکۆڵراوەتەوە، هەندە لایەنێکی توێژینەوەی بەخۆوە دیتووە، بەلام سەرجەم شینەکراوەتەوە.

لە ل ٨ و ٩ دا هەندەك لەو سەرچاوە ئینگلیزی و ڕووسی و کوردی و عارەبییانە دەستنیشان دەکات کە بۆ کارەکەی سوودی لێوەرگرتوون. دواتریش لە ل ٣٨٩ بەدوا، لیستەی سەرجەم سەرچاوەکانی ڕێکخستووە. لە هیچ یەکێك لەو سەرچاوانەدا پەنجە بۆ کارنامەی دوکتۆراکەی ویلسن ناتالی هاول ڕاناکێشێت، کە ١٩٦٥ لە زانستگەی فێرجینیا دەربارەی ئەم مەسەلەیە نووسیویە. بڕواشم نییە نووسەر لێیبێئاگابێت و سوودی لێوەرنەگرتبێت. (٢)

هەروەها دەربارەی ئەو گوتارانەی لەسەر لایەنێك لە بابەتەکانی ئەم باسە نوسراون، پەنجە بۆ ئەو گوتارەی (ن. بێکەس) ڕاناکێشێت کەلەژمارە ٢-١ ی گۆڤاری (دراسات کردیە) ی ئینیستوتی کوردیی پاریس لە کانونی دوهەمی ١٩٨٥ دا لەژێر سەردێڕی (خیارات للسیاسة السوظیتیة تجاة المسالة الكردیـة) دا نوسراوە، کە دوو ئیحتیمال هەیە:

١- یا نووسینی خودی نووسەر خۆیەتی بەو نێوە خوازراوەوە.

٢- یاخود نووسینی کاك سیامەند زەید عوسمانە کەنووسەر لە ل١٣ دا پەنجەی بۆ گوتارێکی بە فەرەنسی نوسراوی لەو بابەتەی ئەو برایە ڕاکێشاوە.

بەهەرحاڵ لێکچوونێکی تەواوتەواو لەنێوان هەڵسەنگاندنی ئەو بابەتانەدا هەیە، کە هەردوولا شەن و کەویان کردوون.

لە ل٩ دا، لە دەستنیشانکردنی ئەو سەرچاوانەدا کە نووسەر بۆ کارەکەی سوودی لێوەرگرتوون، دەنووسێت:

"نامە و دۆکۆمێنتە تایبەتەکانی ئەرشیفی خۆم، کە لە ماوەی بیست ساڵ تەجرەبە و چالاکیم لە بزووتنەوەی کوردایەتیدا کۆمکردوونەوە".

کاتێك دەڕوانینە ل ٤٠٧، دەبینین نووسەر ژیننامەی خۆیی نووسیوە و دەڵێت:" لە ٩ ی دیسەمبەری ١٩٥١ دا لەدایك بووە"

ئەو کارنامەکەی لە ژونی ١٩٨٥ دا تەواو بووە، بیست ساڵی ئەو تەجرەبە و چالاکییە سیاسیانەی لێدەرکەین، دەمێنێتەوە ١٣-١٤ ساڵ تەمەن. بۆ هیچ ئەورووپاییەك، هەتا بۆ هیچ کوردێکیش جێگەی باوەڕ نییە کە مێرمنداڵێکی سێزدە چواردەساڵانەی وولاتێکی دواکوتووی وەکی عێراقی شێستەکان، بەبەشە دواکەوتووترەکەی کوردستانیشییەوە، سەرگەرمی چالاکیی سیاسی بووبێت و ئەرشیفی تایبەتی کۆکردبێتەوە. جگەلەوە، کەم ماڵ و خانەوادەی کورد هەن، لەو مێژووە کورتیلەی شۆڕشی ئەیلول دا یەکدووجار کتێبخانەی تایبەت و هەتا ئەلبوومی وێنە و پەڕەشڕیان بە خۆراکی توونی حەمام نەکرابێت. من پێموایە ئەو دوو موعادەلەیە لایەکیان هەڵەیە. بۆیە دەبێت لە هەندە

خۆڕوونکردنەوەیەکدا هۆشیاربین و گوتەکانمان بە تەرازووی ژیربێژی پێوانەکەین.

لە هەمان لاپەڕەدا، نووسەر ئەوە ئاشکرا دەکات کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ هەندەك کەسی ناسراو و باوەڕپێکراودا سازداوە و پرسیاری لێکردوون، یەکێك لەوانە کاك کەمال فوئادە. نووسەر لەپاڵیدا نووسیویە "ئەندامی کۆمیتەی نێوەندیی پارتی دێموکراتی کوردستانی ئێراق، پاشان ئەندامی کۆمیتەی نێوەندیی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و بەرپرسی پەیوەندییەکانی دەرەوە".

من خۆم ئەمە یەکەمینجارە ببیستم کەکاك کەمال فوئاد ئەندامی کۆمیتەی نێوەندیی پارت بوو بێت، کەباوەڕ ناکەم، چونکە کاك فازڵ وەکو لە گوتەکەی خۆی دڵنیا نەبێت، یاخود هەر بەڕاستی نەبێت، لەنێو هەموو ئەو پرسپێکراوانەدا، تەنهاساڵەکانی ئەندامێتی کۆمیتەی نێوەندیی پارتی بۆ کاك کەمال تۆمار نەکردووە، دەنا ئەوانی دی هەموو، ساڵانی لێپرسراوێتیان دیاریکراوە، هەرچەندە کاك کەمال بۆ کاکی نووسەر هێند دوورەدەست نەبووە کە نەتوانێت لێیبپرسێت کەی ئەندامی کۆمیتەی نێوەندیی پارت بووە. بەڵام بۆ نەیکردووە ؟ یاخود بۆ نەینووسیوە؟ بەڕای من دوو ئیحتیمالی هەیە:

١- یا هەر ڕاست نییە، گەر وابێت کارێکی نابەجێیە.

٢- یاخود مەبەستی ئەندامێتی کۆمیتەی نێوەندیی تاقمی جەلالییە.

جگەلەوە، دەبێت ئەوەش بڵێم کە هەندەك لە ڕاو بۆچوونی ئەو کەسانەی کاك فازڵ ڕای وەرگرتوون، جێگەی متمانە و بڕوا نیین. چونکە هەرچەندە ئێمە

هەمیشە دۆڕاوبووین، بەلاّم تا ئێستا نەمبیستووە سیاسەتچی کورد هەڵەی کردبێت، هەمووی هەڵەی خەڵکی دیکە بووە ئەو بەستەزمانانە تێیکەوتوون.

با وەك نموونە لاپەڕەی ئەو گوتار و نامیلکە و نووسینانە هەڵدەینەوە کەلەسەر گەورەترین ترازیدیای مێژووی نوێی کورد، لەسەر شۆڕشی چواردە ساڵەی میللەتەکەمان، هەر بە دەستی پاڵەوانانی ئەو ترازیدیایە نوسراون. لە بەرگەوە بۆ بەرگ شۆڕشەکەیان بۆ داشۆریوین هەڵەیان بۆ ڕست کردووین. هەریەکە دەستی چڵکنی خۆی بە داوێنی یەکێکی دی، یاخود تاقمێکی دیکە سڕیوە. کەسێکیان پێینەگوتووین پشکی خۆی لەو تاوانانەدا چبووە؟ بۆ لە ماوەی چواردە پازدە ساڵدا جارێك بەدەنگنەهاتن؟ بۆ لە ئاستیدا کەڕ و کوێر و کاس بوون؟ بۆ ئەو کاتە میللەتەکەیان بەهۆش نەدەهێناوە؟ بۆ هەوڵی چارەسەرییەکیان نەدەدا؟

ئەی ئەو گاڵتەجارییەی ئەوڕۆی کوردستان تاوانی کێیە؟ تاکەی ئاوها بەکێشی دەکەن؟ کەی دەست لەبەرۆکی ئەو میللەتە سەرسەختە بەدبەختە بەردەدەن؟

بەلاّم کورد جوانی فەرمووە: (ئاو لەسەرچاوەوە لێڵە) و (ماسی لەسەرییەوە بۆگەند دەکات).

پاشان دێمە سەر شیکردنەوە و هەڵتەکاندنی هەندەك لەو ڕایانە.

"ئەو ڕاستییەی کە هێشتا مێژووی گەلی کورد، لەبەر زۆر هۆ نەتوێژراوەتەوە، بووە هۆی ئەوەی پوختەیەکی لێرەدا ببێتە ڕێڕەوێك بۆ گەیشتن بە باسە سەرەکییەکەی ئێمە.

لەو لێکۆڵینەوە کەم و بەنرخانەی کە لەکۆن و ئێستادا هەوڵیانداوە لەمێژووی کورد بکۆڵنەوە، لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتناسە ئەوروپی و ڕووسەکان بوون. توێژینەوەی ڕووس و ئەوروپاییەکان لەو بوارەدا، لە کۆتایی سەدەی پێشوو و سەرەتای ئەم سەدەیەدا، گەیشتە چڵەپۆپەی، چونکە ئەو کاتانە ڕووسیاو هێزە ئەوروپاییەکان چاوی تەماعیان بڕیبووە کەلاکی ئیمپراتۆرێتی عوسمانیی و گیانی میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

پاش یەکەم جەنگی جیهانیی و بەشکردنی ناوچەکە بەچەند هێزێکی سیاسی و قوتکردنەوەی ئەم دەوڵەتە تازەڕسکاوانە، ئیدی ڕۆژهەڵاتناسیی ئەوروپایی مەیل و ئارەزووی کۆنی لەدەست دا.

بە پێچەوانەی ئەوەوە، لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتناسیی دەربارەی کورد، لە سۆڤیەت هەر لە برەودایە. بەڵام بەپێی خواست و پێویستیی سیاسەتی ڕەسمیی وولاتەکە، چاك چاك بیراز دەکرێت.

نەتەوەی کورد خۆی کە هیچ کات دەزگەیەکی دەوڵەتیی خۆڕاگرتووی نەبووە، تا ئامراز و کەرەسەیەکی ئابووریی و زانستی دابمەزرێنێت، بۆیە بەئاستەم هەل و دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساوە کە مێژووی خۆی بتوێژێتەوە و بینووسێتەوە . ئەو بەرهەمە کەمانەی دەربارەی مێژووی کورد، کە لەلایەن نووسەرانی کورد، یا بێگانەی ڕۆژهەڵاتییەوە نوسراون، بەپێی هەوا و هەوەسی

سیاسییانەی سەردەمەکە داڕێژراون. گەلەکجار مێژووی کورد لەلایەن مێژوونووسانی خزمەتکار و شۆرباخۆری دەربارەوە، لنگەوقووچ کراوەتەوە. یاخود لەلایەن کوردە ناسیۆنالیستەکانەوە گێز و گوڵنکەی پێدا دووڕراوە و زێدەڕەوی تێدا کراوە".

پاشان نووسەر کورتەیەکی پوخت و بەتام و چێژی مێژووی کوردمان بۆ دەگێڕێتەوە. هەر لە ئیمپراتۆرێتی میدیاوە تا هاتنی ئیسلام. ئەوجا دامەزراندنی دوو ئیمپراتۆرێتی عوسمانیی و فارسی و بەشکردنی کوردستان لە نێوان ئەو دوو هێزە زەبەلاحەی سەردەمەکەدا و پەرتپەرتبوونی لەنێو خۆدا بەسەر چەندین میرنشین و دەستەڵاتی کزۆڵەی مەڵبەندییدا.

پاشان هۆکارەکانی ئەو بەشبەشییە و دروستنەبوونی دەوڵەتێکی کوردیمان لە چوار هۆدا بۆ کاکڵە دەکات:

١- لەبەرچوونی ئابووری، ئەویش بە تالانکردنی کوردستان لەلایەن دوو هێزە مەرکەزییەکەوە. بەو هۆیەوە گەشەکردنی ئابووری کوردستان ڕێی پێگیراوە.

٢- شەڕەکوتەك و کێشەنێوخۆییەکانی میرنشین و دەستەڵاتدارە کوردییەکان، کە لەلایەن هەردوو ئیمپراتۆرێتەکەوە زێتر دنەدراون تا بەو لەت و پەتییە بمێننەوە.

٣- هەستی نەتەوایەتی کورد هێشتا چلوورە بەستوو و سەقامگیر نەبووبوو، بەڕادەیەك کە هەستی ئاینی و مەزهەبی گەلەك بەتینتر بوو. هەردوو ئیمپراتۆرێتەکەی نوێنەر و ڕێبەری هەردوو ئاینزای شیعە و سوننی بوون، کورد

چەکێکی ئیدیۆلۆژیی بەهێزی لەو بابەتەی بەدەستەوە نەبوو، بەڵکە بەحوکمی باوەڕی مەزهەبییان دەبا دووکەوتووی لایەکیان بان.

٤- لەسەروەختی دەستەلاتدارێتی ئیسلامیی پێش مەغۆلەکاندا، پەیوەندیی دەوڵەتی مەرکەزیی و هێزەبندەستەکانی کەنارکەوتووی هێند توند و تۆڵ نەبوو. ڕاستە کورد وابەستە بوو، بەلاّم خەسڵەتی نیمچە سەربەخۆیی خۆی لەدەست نەدابوو. دوو ئیمپراتۆرێتە نوێکە تاڕادەیەك گەشەنەکردوو بوون و لە هەلّپەی چەقبەستنی دەستەلاّتدا بوون. بەو هۆیەوە تالانکارییەکی خەستی ئابووری کوردستانیان دەکرد و لەبواری گەشەکردنی ئابووریدا لە پەلوپۆیان خست.

ئەوجا نووسەر دێتە سەر شیکردنەوەی سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتی کورد و بەریابوونی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد. چوار هۆ بۆ بەهۆشداهاتنەوەی هەستی نەتەوایەتی دەکاتە بەڵگە و یەکەیەکە بە پوختی شییاندەکاتەوە:

١- ڕاپەڕینی میرنشینە کوردەکان دژ بە بەستنەوەی کوردستان بە دەستەلاتی مەرکەزییەوە.

٢- وورپابوونەوە لەڕێگەی قوتابخانە سۆفیزمەکانەوە.

٣- بووژاندنەوە و گەشەکردنی وێژەو ئەدەبی کوردیی لەڕێگەی بەکاربردنی زمانی کوردییەوە.

٤- پەیدابوونی توێژاڵێکی نوێی ڕۆشنبیر.

نووسەر گەشتێك بەسەرەپای ڕووداوەکانی پاش یەکەم جەنگی جیهانییدا دەکات و دەوری کورد و پەیمان و ڕیکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان و کاریگەرێتییان لەسەر مەسەلەی کورد دەستنیشاندەکات.

"بەشکردنی کۆمەڵگەی کوردەواری بەسەر چوار دەوڵەتدا (٣)، کە بە چوار زنجیرەی سنوور تەواو تەواو لێکداپچڕاون و هەربەشەی بە چەقی یەکێك لەو دەوڵەتانەوە شەتەك دراوە، کە گەشەکردنی ئابووری و کۆمەلایەتی هەریەکێك لەو وولاتانە جوداوازلەوی دی و بەپلە و ئاستێکی لێکنەچوو خۆی دەنوێنێت، کۆمەڵگەی کوردەوارییی وا لێدەکات چ لەڕووی کۆمەلایەتی و چ لەڕووی ئابوورییەوە، بەشێوەیەکی لێکدابڕاو و لێکنەچوو و ناساز گەشەبکات."

ئەوجا لە ل٤٥ دا دەنووسێت:

"هەرچەندە مەسەلەی کورد لەم دواییانەدا تارادەیەك لەسەر ڕوویەری بلاوکراوە جیهانییەکان زێتر جێگەی خۆیکردۆتەوە، بەلام مەسەلەکە زێتر لە گۆشەنیگای هەست و سۆزێکی مرۆڤانەوە تێیدەڕوانەدرێت، نەك وەك کێشەیەکی ڕەوا لەنێو بێشەلانی کێشە ناوچەییەکاندا. چاوخشاندنێك بەسەردێری ئەو گوتارانەدائەو ڕاستییەمان بۆ ئاشکرا دەکات.

بەشێوەیەکی گشتیی گوێڕاهێشتن و بایەخی کەمتر بەو کێشە و گرفت و ڕووداوانەی ڕۆژهەلات دەدرێن، کە نەك تەنها سنوور و سیستێمی سیاسی، بەڵکە خەریکن پێکهاتەی ژیاریی ناوچەکەش هەڵتەکێنن و وەریچەرخێنن.

ئالەو فەرامۆشی و پشتگوێخستنەدا هۆی ئەوە دەدۆزینەوە کە مەسەلەی کورد هێشتا وەکو کێشەیەکی نێوخۆیی ئەو وولاتانەی کوردیان بەسەردا بەخشراوەتەوە، مامەڵە دەکرێت".

ئەم مەسەلەیەی کاکە فازڵ پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە تاڕادەیەکی زۆر ڕاستە. بەلاّم مەخابن خۆی لەقەرەی هۆکارە سەرەکییەکە نەداوە، ئەویش قسرەخۆیی و قسوورە زاتییەکەیە، کەماکی یەکەمی ئەو جوغز تەسکبوونەوەیەی مەسەلەکە و ترنجاندنی لەو قالّبە تەسکە و هێشتنەوەی لەسەر ئاستی کێشەیەکی نێوخۆیی ئەو وولاتانە و نەگەیاندنی بە ئاستێکی نێودەوڵەتییە.

ئەو بێهۆشی وگێلێتییە بەپلەی یەکەم، گەردنی ئەستووری سیاسەتچی و حیزبە زۆر و زەوندەکانی کورد دەگرێتەوە. ڕاستە بارودۆخی کەرتوپەرتکردنی میللەتێك و خاکەکەی بەسەر پێنج وولاتدا هێجگار سەخت و ئەستەمە و کێشەکەی زۆر دژوار و ئالّۆز کردووە، بەلاّم هەڵوێستی ئەو حیزبانەی کە لە نێوەڕاستی چلەکان بەدواوە، ڕۆڵێکی دیاریان لە چارەنووسی کێشەکەدا دیتووە، هەڵوێستی حیزبە چەپی و کۆمۆنیستەکان قەت و قەت لە ئاستی پێویست و پیرۆزدا نەبوون . چۆن؟

جولاّندنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە بنەچەدا داواکاریی (مافی چارەنووس) و (سەربەخۆیی و ڕزگاریی) بووە، بەلاّم بەفەند و فێڵی سیاسی و لووتتێژەنینی ئیمپریالیزم و داگیرکەران و پشتکردنە فەلسەفە و ئیدیۆلۆژیی نەتەوایەتی، کۆمەڵە سیاسییەکانی پاش نێوەڕاستی چلەکانی ئەم سەدەیەی خلیسکاندۆتە مەوقیعی خۆبەدەستەوەدان و ترس و ڕاڕایی و هەڵسڵەمینەوە و

هەستی پەستی خۆ بەکەمگری و بڕوا بەخۆنەبوون و هەتا خۆدۆڕاندن و خۆلەبیرچوونەوەش. داواوداواکاریی ڕەوا و سروشتیی کوردیان لەقالبی چەند ڕیفۆرم و چارە و چارۆچکەیەکی ئیداری و ڕۆشنبیری و پێکەوەگوزەراندندا، ترنجاندووە.

وەك پاشان دێمەسەری و ڕوونیدەکەمەوە، دەوری پارتەکۆمۆنیستەکانی ناوچەکە، دەورێکی زۆر ناتێگەیشتووانە و ناکاملانەبووە بەرامبەر بە مەسەلەکە.

ئەم نەوێری و ترس و لەرزە و خۆبەکەمگریەی ئەو هێزە سیاسییانەی کورد، بۆتەهۆی ئەوەی:

١-جەماوەری عارەب و تورك و فارس بەتەواوی لەمەسەلەی کورد نەگەن و بارێکی دەروونیی وایان لا بخوڵقێندرێت کە گوایە کورد وەکو بەشێك لەو وولاتانە زێدەڕەویی و زێدەداوایی دەکات و کێشە و گێچەڵ بۆ ئەو گەلانە دەنێتەوە و لەمپەڕ و کۆسپە لەڕێی پێشکەوتن و سەرکەوتنیاندا. بۆیە زۆرجاران سەرەڕای ئەو هەموو ناڕەوایی و تاوان و دەستدرێژی و خراپەکارییەی حوکومەتەکان بەرامبەر کورد کردوویانە، جەماوەری ئەو وولاتانە، ئەگەر هەڵوێستێکی نەرێتی و دوژمنانەشیان نەبووبێت، ئەوا هەڵوێستێکی گوێنەدان و کەمتەرخەمی و بێدەنگانەیان نواندووە.

٢-ئەو گەلانە خۆیان تائێستا ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ، بەجۆرێك لە جۆرەکان، گیرۆدەی داو و تەونی پیلان و گزی ئیمپریالیزمن، هەموو جولاندنەوەیەکی کورد بەفیتی بێگانە و ئیمپریالیزم و بەرێگر لەڕێی خەباتی

خۆیاندا دەزانن. وا لە کورد دەگەن کە گوایە بەشێکی زۆر لەتین و تاو و هێزیان بەفیڕۆ دەدات و ناهێڵێت بەتەواوی خۆ بۆ پاکتاوکردنی کێشەکان و سڕینەوەی شوێنپێ و بوونی ئیمپریالیزم تەرخانکەن و بکەونەوە سەرخۆ بۆ ڕزگاریی و سەربەخۆیی و گەشەکردنی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری.

٣-جەماوەری کورد چەواشە دەکات و لەمەسەلە بنەڕەتییە مێژوویەکەی دووری دەخاتەوە، لەهەندێك لاباس و مەسەلۆچکەی دوور لەکێشە سەرەکییەکانیەوە دەگلێنێت، کە نە ئەو چارەسەر و داواکاریانە کۆتایی بەکێشەی کورد دەهێنن و نە ویست و خواستی جەماوەر دەهێننەدی.

٤-کاتێك مەسەلەی کورد لەه قولینچکی مەسەلەیەکی نێوخۆیی و کێشەیەکی لاوەکی دەترنجێندرێت، گوڕ و تین و تاوی ئەو مەسەلەیە کزدەبێتەوە و هەق دەدات بە دەستەلاتدارێتیی داگیرکەرانی کوردستان، کە بە بیانووی ماف و بەرژەوەندیی گشتیی و پارێزگاریی یەکپارچەیی خاکی وولات و سوودی نیشتمانەوە، هەموو تاوانێك بکەن و نووزەمان لێببڕن و کەسیش مافی ئەوەی نەبێت لەسەرمان وەدەنگ بێت و خۆی لەکێشەیەکی نێوخۆیی ئەو وولاتانە هەلقورتێنێت و قسەی تێدابکات.

ئەگەر هەر لەسەرەتاوە مەسەلەی نەتەوایەتیمان وەك مەسەلەیەکی خاوەن هەق و داد و سەربەخۆ پێشچاو خرابا و ئامانج و ستراتیژ و ئاواتی کورد، بە (لامەرکەزی) و (خودگەردانی) و (حوکمی زاتی) و پاشانیش (ڕاستەقینە) نەشاردرایاتەوە و ڕەپ و ڕاست کورد وەك نەتەوەیەکی دیل و ژێردەستە و چەوساوەی خاوەن (مافی دیاریکردنی چارەنووس)، بەپێی هەلکەوت و

هەلومەرجی نەتەوایەتی مامەڵەی لەگەڵ کرابا و پێشچاو خرابا، ئەورۆ هیچ نەبا هۆشی جەماوەرەکە و هەتا دوژمنانیش بەوە ڕادەهات کە لەسەر ئەو ئاستە مامەڵە و هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکەن و بەرژەوەندیی نێودەوڵەتانیش سووچێکی بۆخۆی دەدۆزییەوە و لەنێو ئەو هەموو گۆڕان و گۆڕانکارییانەی لەماوەی ئەو نیو چەرخەدا بەسەرنێوچەکەدا هاتبوو، ئەو هەلانەی هاتبوونە پێش شتێکیان هەرلێشین دەبوو. چونکە گەر هۆکارە خۆییەکان هاوشانی هۆکارە مەوزوعییەکان بان، ئەو کاتە هەلی هەڵکەوتوو یەکی لەسەر پێگەیشتنی هۆکاری خۆیی نەدەکەوت و لەبار نەدەچوو. (٤)

ئەورۆوا دەمەدەم و گیانەڵڵای سەدەی بیستەمە، لە دووسێ پارچەی کوردستاندا، شۆڕشی چەکدارانە دژی دوو داگیرکەری هێزلێبڕاوی پشووسوار لەکلێپەدایە، دەیان پارت و کۆڕ و کۆمەڵی سیاسی لە ساحەکەدان، سەرپاکیان بانگاشەی کێشەیەکی نێوخۆیی دەکەن، نەك کێشەی میللەتێکی بیست و هێندە ملوێنیی بێبەریی لە هەموو مافێکی سەرەتایی. با سەرێك بەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و بەیاننامەی ئەو حیزبانە و هێزە ئۆپۆزیسیۆنەکانی دیدا شۆڕکەینەوە، دەیان بانگ و بانگاشەی سەرکردەکانی ئەو حیزبانە دەدیترێن کە سەد و یەك پاکانە دەکەن تا بیسەلمێنن (جوداخواز) نیین. گەر مرۆ بە ویژدانەوە مەسەلەکە هەڵسەنگێنێت، بلاوکراوە جیهانییەکان بەڕێزترەوە لەمەسەلەکە دەڕوانن وەك حیزبە کوردی و ئۆپۆزیسیۆنەکانی ناوچەکە. ئیدی چ مافێکمان دەکەوێت گلەیی لەوان بکەین؟ خۆمان لە ئاستی مەسەلەکەدا نیین، خۆمان لە خودگەردانیی زێترمان نەخواستووە. دروشم و پرۆگرامی

سەرپاکی حیزبەکان لە بانگاشەی کێشەیەکی نێوخۆیی تێناپەڕێنێت. دیارە ئامانجی هەمووشیان ، دوو کورسی وەزارەتە نەك فسکەفسکی هەرزەخەڵتێن.

ئەو هێزە ئۆپۆزیسیۆنانەی کەوڵی خۆیان لە دەباخانەی ئەو ڕژێمانە قوتارکردووە و لە ئەشکەوتەکانی کوردستانیان قایمکردووە، لە کاتێکدا بە دە چاو بۆ واقواقییەك و کوێ و کوێییەك شیوەنیانە، ئەگەر زۆر پێشکەوتنخوازبن ئەوا (ڕاستەقینە) یەکیان لەکلکی ئێمە جەڕاندووە، ئیدی کەسیش نازانێت ئەو دەعبا ڕاستەقینە چییە.

بۆچی گوتمان پارتە کۆمۆنیستەکان دەورێکی ناتێگەیشتووانەیان هەبووە؟

١-بیری کۆمۆنیستیی یەکەم بیرێکە کە بەنێوی دۆستایەتییەوە دەستی تەسلیمبوونی بە کورد هەڵبڕیوە و بەند و باوی عێراقێتی و ئێرانێتی و سوریایەتی کوردی داهێناوە. ئەوەی چەندین ساڵ ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فەرەنسی بەزۆر و گوشارخستنەسەر بۆیان نەسەپی، ئەمان بە خشکەیی بە نێوی دۆستایەتییەوە پیادەیان کرد و حیزبە بۆرژواکانی کوردیان پێ دەستەمۆ کرد. هەر لەسەرەتاوە کوردیان وەك کەمەنەتەوەیەك پێناسە دەکرد (٥) ، نەك وەك نەتەوەیەکی بەشخوراوی زۆرلێکراوی کوتکوتکراو. سیاسەتی (بانێکە و دوو هەوا )یان لەگەڵ کورد پەیڕەو دەکرد. هەرلەمێژە ئەو بەند و باوەیان داهێناوە کە گوایە جودابوونەوەی کورد، هێزی پرۆلیتاریای سەرنەجوقاوی عێراق، یا سوریا، یا کوێ و کوێ پەرتپەرت دەکات. کەچی لەتکردنی پرۆلیتاریای گلاراوی میللەتێکی وەك ئاڵەمان، یا کۆریا، یا ئەو کاتەی ڤێتنام، هیچ زیانێکی بۆ پەزەکانی پرۆلیتاریای جیهان نەبوو.

٢-هەرکات هەل و دەرفەتیان بۆ ڕەخسابێت زێتر پشتگیریی و هاریکاریی هێز و حیزبە بۆرژواکانی ئەو دەوڵەتەداگیرکەرانەیان کردووە و هەمیشە بۆرژوای گەمژە و گێژ و وێژی کوردیان سەرکوێر و سەرکۆنە کردووە، وەکو بۆرژوای کورد بەهیوای چەوساندنەوەی ئەو میللەتانە بێت، نەك ئەوان بەردەوام خوێنی ڕەش و ڕووت و بۆرژوای کوردیش بمژن.

٣-بەو هەڵوێستانەیان و هەتا گەلەکجار بە هەڵوێستی دوژمنکارانەشیان بەرامبەر مەسەلەی کورد، بارێکی وایان نەخوڵقاندووە کەجەماوەری میللەتە سەردەستەکە پڕاوپڕ لەکێشەی کورد تێبگات و وەکو کێشەیەکی ڕەوا تێیبڕوانێت.

٤-بەردەوام دژی بیری ئازادیخوازانەی کورد وەستاونەوە و بەشۆڤێنیست و بەکرێگیراوی بێگانە و گومانلێکراو و ڕەگەزپەرست جوێنبارانیان کردووە. ئەوەتا هەتاکو ئێستاش (مافی چارەنووس) ێکی سادە و ڕەوان بەکورد ڕەوا نابینن. کە گوترا (مافی چارەنووس)، یانی دەبێت بڕیار بدەیتە دەست میللەتەکە خۆی و ئەو چارەنووسی خۆی دیاریکات. بەڵام ئەمان نێوی (مافی چارەنووس) ی لێدەنێن و خۆیان پێشەکیش بڕیاردەدەن ئەو چارەنووسە چییە، زۆر ئاسان بە (ئۆتۆنۆمیی ڕاستەقینە!) بۆمان پووچدەکەنەوە. ڕەنگە وەرامیان ئەوە بێت کە گوایە حیزبە کوردییەکان خۆیان لەوە زێتر ناخوازن! بەڵام ئایا دەبێت (پارتی پێشڕەوی چینی کرێکار) ڕێچکەشکێن بێت، یاخود دووکەوتووی بیر و ڕەفتاری بۆرژوایان.

با لێرەدا چەپکێك لە گوتەکانی لینین بکەینە بەڵگەی چەوتیی ئەو هەڵوێستانە:

(لەسەر سۆسیالیستەکانی نەتەوە چەوسێنەرەکان پێویستە داوای مافی ئازادیی جودابوونەوەی نەتەوە زۆرلێکراوەکان بکەن، دەنا بانگاشەی هاوسانیی مافی میللەتان و هاریکاریی کرێکاران، دەبێتە هەرا و هوریایەکی ساختە، دەبێتە ناپاکییەکی پەتی). (٦)

(هەر سۆسیالیستێکی نەتەوە چەوسێنەرەکە، لەکاتی شەڕ و ئاشتیدا، پڕوپاگەندە بۆ سەربەستیی جودابوونەوەی نەتەوە زۆرلێکراوەکە نەکات، ئەوا نە سۆسیالیستە نە ئومەمی، بەڵکە شۆڤێنی و ڕەگەزپەرستە). (٧)

(هەرکەسێك ئەو جۆرە ڕاپەڕینانە بە ئاژاوە نێوبەرێت، یا کۆنەپەرستێکی زۆر پیسە، یا خاوەن بیرێکی ووشکی ئەوتۆیە، کە توانای تێگەیشتنی شۆڕشی کۆمەلانی خەلکی نییە). (٨)

(ئێمە دەزانین و دەبینین و ڕۆژانە هەستدەکەین، کە ئینکارکردنی مافی جودابوونەوە، کلاوبازییەکی بێسنوورە و خزمەتی ڕاستەقینەی شۆڤێنیستەکانی نەتەوە چەوسێنەرەکە دەکات). (٩)

(هەر میللەتێك بەبڕیاری پادشایەك یا حوکومەتێك بە میللەتێکی دییەوە پەیوەستکرا، نەك بە خواستی ئازادانەی زۆربەی میللەتەکە خۆی، ئەوا ئەو میللەتەزۆرلێکراوە و پێبەندکراو. دژوەستاندنەوەی پێبەندکردن ئەوەیە کە هەر میللەتێك مافی ئەوەی بدرێتێ کە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆخۆی دابمەزرێنێت). (١٠)

با بگەڕێینەوە سەر نووسینەکەی کاك فازڵ:

نووسەر ژیرانە هەڵەی سەدجارەی کورد دەستنیشاندەکات و دەڵێت:

"هەتا کورد بۆی نەلواوە وەك کەمەنەتەوەیەکیش چارەسەرێك بۆ کێشەکەی پەیدابکات. هۆی ڕاستەقینەی ئەوەش هیواهەڵچنین و پشتبەستنی کورد بووە بەهێزە دەرەکییەکان. ئەمەش ڕێی ئەوەی بۆ هێزە ناوچەیی و جیهانییەکان خۆشکردووە، کە بەپێی بەرژەوەندیی خۆیان بازیی بەمەسەلەکە بکەن، وولاتانی داگیرکەریش وەك داردەستێك و بەکرێگیراوێکی بێگانە لەکورد بڕوانن".

بەپێویستی دەزانم لێرەدا دوو زیانی زەقی دیکەی ئەو پشت بەبێگانەبەستنە بخەمە سەر ڕاوبۆچوونەکانی کاك فازڵ:

١-ئەو پشت بەبێگانە بەستنە، وای لە کورد کردووە کە باوەڕی بە توانای خۆی نەمێنێت و هێزی لەبنەهاتووی ڕەش و ڕووتی میللەتەکە لەبیربکات و زێتر و زێتر پشت بە کۆمەکی بێگانە ببەستێت، کە گەلەکجار لێشاوی کۆمەکەکە، شۆڕشگێڕانی میللەتەکەی پەڵەخاندووە و لەکەڵکی خستوون، وەك لە شۆڕشی ئەیلولدا دیتمان.

٢-لەبەرامبەر ئەو کۆمەکانەدا، گەلەکجار کورد ناچاری ئەوە بووە شەڕی بەرژەوەندیی ئەو هێزانە بکات، نەك چارەنووسی خۆی.

"ڕۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت تادێـت، نـرخ و بایـەخی زێـترلـە پێوەنـدیی و کێشمەکێشی هێزە زەبەلاحەکاندا پەیدا دەکات. نەوت وەکی ماددەیەکی خاوی ووزەدەری گەلـەك بەنرخ، هەلکەوتی ستراتیژییانەی ناوچەکە، هۆ گرنگەکانی ئـەو بایـەخ پەیداکردنـەن. بـەو هۆیـەوە ناوچـەکە لـەژێر گوشـارێکی تونـدی دەرەکیدایە، کە لە ململانێی زلهێزەکاندا خۆی بەدەردەخات. لـەژێر تینی ئـەو گوشـارەدا و بـەهۆی ئـەو تـەنگ و چـەلّەمانەی لـەو ناوچـە تێکـچڕژاوە ئـاینی و ئێتنی و نەتەوەییە جۆرجۆرانەدا، کە سالآنێکی زۆرە لە قولّپدان و تاوسەندندان، پێدەچێت لە داهاتوویەکی نێزیکدا، کێشەکان چڕتر و ئالّۆزتر بن.

لەنێوان هەردوو جەنگە جیهانییەکەدا، ناوچەکە پاوانی هێزە ڕۆژئاواییەکان بوو، پاش دووهەم جەنگی جیهانیی، بوون و دەستەلاّتی ڕۆژئـاوا ڕووی لـەکزیی و کەمیی کرد. شورەوییش وەك زلهێزێکی تازەپێداکەوتوو، هەولّی دا، لە بەرامبەر ئـەمریکا و هێـزە ئەوروپاییەکانـدا جێپـیّ و گورێـك پەیـداکات. ئـەو بـارە نێونەتەوەییـە نوێیـە و گەلـەك هۆکـاری دی و پەیـدابوونی هەنـدەك دەستەلاّتی ناوچەیی، کلّپەی گەلەك کێشەیان هەلاّیساند.

باری پاش دووهەم جەنگ، ڕێی هاتنەنێووەیان بۆ سۆڤیەت خۆشکرد، تا هەولّی بنکە و پێگە پەیداکردن بدات. ئەم هۆکارانە بواری ئەو هاتنەنێووەیان ڕخساند:

١-گرژبـوون و گـەرمبوونی کێـشەی عـارەب و ئیـسرائیل، لـە ١٩٥٦ بـەدواوە ئیسرائیل ، لەلایەن هێزە ڕۆژئاواییەکانەوە پشتگیریی تەواوی لێدەکرێت.

٢-سەرهەڵدانی بیری ناسیۆنالیزمی عارەبی، کە بەهۆی گەلەك هۆکاری مێژووییەوە، سەنگەری بەرامبەریان لە وولاتە رۆژئاواییەکان و وولاتانی هاوسەنگەریان گرتووە.

٣-ئەو کودەتایانەی لە پەنجاکاندا لە میسر و عێراق و سووریا روویاندا.

٤-شۆڕشی ڕزگاریخوازانەی جەزائیر و یەمەن و پاشانیش بزووتنەوەی ئازادیخوازی فەلەستین.

لەحەفتاکاندا شوورەوی لەگەڵ شەش وولاتی ئەم ناوچەیەدا شەش پەیمانی دۆستایەتی و هاریکاریی مۆرکردووە، لە هەندێکیاندا بنکەی سوپاییشی دراوەتێ. لەم سالأنەی دواییدا هەمدیسان بڕێك لەو پایگایانەی لەدەست دایەوە.

مەسەلە بەلای سۆڤیەتەوە تەنها، بوونی لە ناوچەکەدا و پەیوەندی بەستنی لەگەڵ ئەو وولاتانەدا نییە، بەڵکە مسۆگەرکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆشیەتی.

بەهەرحاڵ شوورەوی چەند ئامانجێکی دیاریکراوی پێشچاوگرتووە:

بۆ زلهێزێکی دەستەلاّت و پاوانخوازی وەکی شوورەوی، رۆژهەلأتی نێوەڕاست چ لەڕووی سوپایی و چ لەڕووی ستراتیژییەوە، هێجگار گرنگ و پڕ بایەخە. دەستبەسەرداگرتنی ڕێگەی هامشۆی زەریایی و بەندەرەکان و دامەزراندنی بنکە بۆ هێزە زەرياییەکانی، شادەماری ئامانجە سوپاییەکانێتی. جگەلەوە ئەم ناوچەیە دەروازەی لەسەرخوارووی ئەورووپا و سەرووی ئەفریقا و باشووری ئاسیایە.

٢-دەستگرتن بەسەر نەوت و غازی ناوچەکەدا، جگەلەوەی چکبڕکردنی هێزی ووزەی ئەورووپای ڕۆژئاوایە، ڕەگی ژیانی خۆی و مسۆگەرکردنی پێداویستییەکانی وولاّتانی (کۆمیکۆن) و هێشتنەوەیانە لە بازنەی دەسەلاّتی خۆیدا.

٣-ئالّوگۆڕی بازرگانیی و ئالّ و ویَلّ لەگەلّ ئەو وولاّتانەدا، تا لەو ڕێگەیەوە لە جوغزی دەستەلاّتی ئەوروپای ڕۆژئاوایان دەربکێشێت.

٤-فرۆشتنی چەك و تەقەمەنی بەو وولاّتانە، کە لەلایەکەوە بەڕەوڕەوەی سۆڤیەتییانەوە دەبەستێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە گەورەترین دەستکەوتی ماددی و سوودی لێوەردەگرێت.

٥-لەڕێگەی خالّەکانی ٣ و ٤ و کۆمەك و پەیمانە کولتوریی و ئابوورییەکان و چالاکیی پارتە کۆمۆنیستەکان و ئامرازە پڕوپاگەندەییەکانی دیکەی سۆڤیەتەوە، بەرنامەیەکی کولتووریی درێژخایان نەخشەکێشدەکرێت، کە کاریگەرێتی و تین و تاوی لەسەر چەند وەچەیەك لە خوێندکار و زانا و لێکۆلّەرەوەکان بەردەوام دەبێت.

بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە، ئەم ئامرازانە بەکاردەهێنێت:

١-قۆستنەوەی هەلی ڕەخساوی کینە و ڕق لە ئەمریکا و وولاّتە ڕۆژئاواییەکان، کە بەهۆی سالاّنێکی دوور و درێژی دەستەلاّتی کۆلۆنیالیستانەیانەوە لە ناوچەکەدا و هەلّتۆقینی ئیسرائیلەوە، هاتۆتەگۆڕێ. بۆیە بە ناچاری پێویستیان بە هاوکاریی شوورەوی هەیە، هەرچەندە هەندێکیان وولاّتانی ئەنتیکۆمۆنیستیشن.

٢-قۆستنەوەی کێشە ناوچەییەکان، کە لەم ساڵانەی دواییدا، چ لەڕووی سیاسی و چ لەڕووی سوپاییەوە لەبرەودان و گەلەکجار ڕاکێشانی سۆڤیەت دەرەخسێنن. وەك کێشەی عێراق-ئێران، عێراق- سوریا، یەمەنی سەروو- یەمەنی خواروو، جەزائیر- مەراکیش، صۆماڵ- ئەتیوپیا، لیبیا- تشاد، لیبیا- سودان، بڕێکن لەوانە. هەندەجارێك سۆڤیەت پەیوەندیی لەگەڵ هەردوولادا دەبەستێت، بۆنموونە وەك لەکێشەی سوریا و عێراقدا.

٣-پشتگیریکردنی پارتە کۆمۆنیستەکان و لەم دواییەدا زۆر ڕێکخراو و بزووتنەوەی ناکۆمۆنیستیش، تا گوشار بخاتە سەر ئەو وولاتانە و لە ململانێی زلهێزەکانیشدا، داشی زێتر بەدەستەوە بگرێت.

ئەو پارتە کۆمۆنیستانە هەندەجارێك وەك هێزێکی گوشارخەرەسەر و زۆربۆهێنەر، بڕەجارێکیش وەك هێزێکی پشتیوانیکەر و هاوکاریکەر، لەو وولاتانەدا ڕۆڵی خۆیان دەبینن.

٤-خاوکردنەوەی ڕەوتی تیژڕەوی ناسیۆنالیستانەی پارتە دەستەلاتدارەکانی ئەو وولاتانە و خستنەسەر ڕێچکەیەکی ڕادیکالانە، وەکو ئەو هەوڵە بێ سەرئەنجامانەی لە شێستەکاندا لە میسر و عێراق و جەزائیر بەخەرجیاندا، پاشانیش لە حەفتاکاندا لەیەمەنی خواروو.

٥-لەڕێگەی شاڵاو و هەڕەشەوە، بۆنموونە وەك لە ئەفغانستاندا. یاخود بە گوشاری سوپایی ناڕاستەوخۆ، کە لەڕێگەی هاوکارەکانییەوە دەخرێتە سەر وولاتانی دی، وەك لە کێشەی ئەتیوپیا و صۆماڵ دا، یاخود لە شاڵاوی یەمەنی خواروو بۆسەر سەروو دا.

٦-بەستنی پەیمانی هاوکاریی و دۆستایەتی، کە سوودی ئابووری و کولتووریی چاك بۆ سۆڤیەت مسۆگەر دەکات و هەندەجارێك بنکەی سوپاییشی بۆ فەراهەم دەکات. وەك ١٩٧٠ لەگەڵ میسردا، ١٩٧٢ لەگەڵ عێراقدا، لەگەڵ ئەتیوپیا و ئەفغانستان و سوریادا".

پاشان نووسەر لە ل٦٥ دا دەنووسێت:

"لە ململانێی سۆڤیەتی تازەدامەزراوی پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر و بەریتانیای مەزن و هێزە ڕۆژئاواییەکانی دیکەدا، مەسەلەی کورد هەمیشە هۆ و ئامرازی کێشە و تێکگیربوونیان بووە. سۆڤیەت بەگومانەوە لەخەباتی ئازادیخوازانەی کوردی ڕوانیوە و بەبازییەکی ئیمپریالیزمی تێگەییوە، تا بتوانن لە قوڵی باشوورەوە شوورەوی گەمارۆ بدەن. بەو شێوەیەش هێزەکانی ڕۆژئاوا، پاش دووهەم جەنگی جیهانیی، خەباتی ئازادیخوازانەی کوردیان بە هەوڵ و تەقەلایەکی شوورەوی زانیوە، تا لەو ڕێگەیەوەجەمسەری پردێك بەرەو کەنداو درێژکات".

لەبەر ئەوەی ئەم بانگاشە و هەڵوێستەی سۆڤیەت بێبنچینەیە، ناچارم کەمێك هەڵیشێلم و ڕای خۆم لەو بارەوە ڕوونکەمەوە. بەشیکردنەوەیەکی ڕووداوە مێژووییەکانی ئەو سەردەمە، ئەگەر تەواو تەواو ئەم بانگاشەیە پووچ نەکاتەوە، ئەوا دەیخاتە بەر ڕێژنەی گومانەوە، بەم هۆیانەی خوارەوە:

١-پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر، شوورەوی خۆی بەندەکانی پیلانی سایکس-بیکۆی لەقاودا، کە هێزە ڕۆژئاواییە زەبەلاحەکانی ئەوکاتە (ئینگلتەرە و فەرەنسا) لەمێژ بوو نەخشە و پلانی بەشکردنی کەلاکی پیاوە پەککەوتەکەیان

کێشابوو. لەو نەخشە و پلانەدا، نەك هیچ مافێکی کورد وەبەرچاو نەگیرابوو، بەڵکە وولاّتەکەشیان وەك میراتی وەجاخکوێران بەسەر چەند دەولّەتێکی تازە هەلّتۆقیوی دەسندەخۆری خۆیاندا بەخشیبووەوە.

٢-شووورەوییەك، وەکو نووسەر خۆی لەچەند جێگەیەکدا پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە، ئەو میراتە هێجگار دەولّەمەندەی کوردۆلۆژیی لەتەزارەکانەوە بۆمابێتەوە و پێوەندیی و ناسیاریی کورد و ڕووس هێندە مێژینە بێت و خۆیان باری کورد لەو بارو دۆخە دا کەساڵانێکی دوور و درێژ گێنگڵی تێدا داوە و لەپێناوی ئازادییدا باجی خوێنی داوە، وا لە نێزیکەوە بناسن، بایی هێندە ناکات بەگومانەوە تێیبڕوانن، ئەگەر بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکان بڕوا و بڕیاریان پێوەرنەچەرخێنێت.

٣-هەر لەسەردەمی شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە هەتا سەرەتای سییەکانیش، چ لە کوردوستانی خواروو، چ لە کوردستانی ڕۆژهەلاّت و چ لە کوردستانی ژووروو، زنجیرەیەك شۆڕشی ئازادیخوازانەی کورد بەرپا بوون، کە بە کۆمەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی ئەو هێزە ئیمپریالیزمانە سەرکوتکراون. گەر ئینگلیز پێویستی بەو بازییە با، کەسێکی وەك شێخ مەحمودی دەکردە مەلیکی عێراق، نەك فەیسەلّێکی لەدەرەوە خوازراو. یاخود لانی کەم دەیکردە مەلیکی کوردستانی خواروو، تا بازییەکەی لەگەرمبوون و بەردەوامییدا بێت. ١٣-١٤ ساڵی ڕەبەق شێخی مەزن دژی ئینگلیز و بەکرێگیراوەکانی جەنگا و ئەوانیش دژی کورد. شێخ مەحمود هانای بۆ لێنین و شۆڕشی ئۆکتۆبەر برد. لە کوردستانی ڕۆژهەلاّت سمکۆی قارەمان بەدەستی ڕەزا خانی دەسندەخۆری

ئینگلیز شەهیدکرا و شۆڕشەکەی خامۆشکرا. ئێرانی دەسندەخۆری ئینگلیز سنووری بۆ ژەندرمەی تورك ئاواڵە کرد، تا پشت لە شۆڕشگێڕانی ئاگریداغ بگرن. فەرەنسییەکان ڕێگەی شەمەندەفەری حەلەبیان بۆ ئۆردووی تورك فەراهەمکرد، تا بتوانن خێرا ئابلوقەی کورد بدەن و سەرکوتی کەن.

٤-بۆ دەبێت شوورەوی ترس و دڵەڕاوکەی لەکوردستانێکی هێشتا دانەمەزراو هەبێت، کە گوایە ببێتە داشەهارەی دەستی ڕۆژئاوا، کەچی هیچ ترس و باکێکی لە ئێرانێکی تازەدامەزراوی بەکرێگیراوی ئینگلیز نەبێت، (١١) کە درێژایی ٢٥٠٠ کم سنووری خوارووی لەگەڵیدا هاوبەشە و پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ ڕەزاخان دا مۆرکات ؟

٥-بۆ شوورەوی ئەو گومان و دردۆنگییەی لە هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەن نەبوو، کە ڕۆژئاواییەکان وەکو شوورەوی و پتریش پشتگیرییان لێدەکرد و خەریکبوو کوردستانی ژوورووش لەبۆتەیدا بتوێننەوە؟

ئێدی داخۆ ئەم ڕووداو و واقیعە لەچاوچەقیوانە، بەشی هێندە دەکەن کە سیاسەتمەدارانی ئەوکاتەی شوورەوی لەسەر بەندی خەیاڵ بژێن و بڕیاری ئاوها هەرزانە و ساکارانە بدەن؟

بەبڕوای من مەسەلە جۆرێکی دییە و ئەو هەڵوێستانە بە وریایی و ئاگایانە و بەپێی پێویستیی ڕۆژ و پلانی سیاسی و بەرژەوەندیی نێونەتەوەییانەی دەوڵەتێکی تازەپێداکەوتووی کۆمۆنیستیی وەبەرگیراون. ئەو کاتە سەبارەت بە مەسەلەی کورد، دوو موعادەلە لەبەردەم دەوڵەتی شوورەوییدا بوون:

١-میللەتێکی بێ دەوڵەتی چەوساوەی لێکداپچڕاوی پارچەپارچەکراو، کە لەپێناوی ئازادییدا دەستەویەخە لەگەڵ داگیرکەرانیدا وەستاوەتەوە و لەجەنگێکی چارەنووس نادیاردایە. گەر بەپێی بانگاشە و فەرموودەی دەقی نێو کتێبە سوورە ئەستوورەکان بێت، دەبێت شوورەوی پشت و پەنای گەلانی زۆرلێکراو، تا دواپلەی سەرکەوتن پشتیوانیی لێبکات، چونکە میللەتێکە نەك هەر لەبەر لووتیدایە، بەڵکە پارچەیەکیش لەخاکەکەی لەچوارچێوەی دەوڵەتەکەیان گیراوە. کە نایکات و بەرژەوەندییەکانی وا پێویست دەکات هەڵوێستێکی پێچەوانە لە بانگاشەکانی وەبەر بگرێت، ناچارە بەڵگە و پۆزشی دەمکوتکەر بهێنێتەوە، تا ویژدانی خۆی پێ سڕکات و دەمی پرسیاریشی پێ کپکات. بۆیە بەند و باوی گومان و دردۆنگیی دەکرێتە بیانوو.

٢-چەند دەوڵەتێك کە لەسەر ئاستی نێونەتەوەییانە دانیانپێدانراوە و سنووریان چەسپاوە، پەیوەندیی دیبلۆماسیی لەگەڵ هەموویاندا و دۆستانە لەگەڵ هەندێکیاندا گەیشتۆتە تەرزفرێدان و بەردان. ئەوەبوو لە ٢٢/٢/١٩٢١ دا پەیمانی دۆستانە لەگەڵ ڕەزاخان دا مۆرکرا (١٢)، لە ١٦/٣/١٩٢١ یشدا لەگەڵ ئەتاتورك دا (١٣)، کە ئەو سەردەمە پارتێکی کۆمۆنیستی ساختەی لە تورکیادا بە تۆرانییەکی وەك حەقی بەهیج (١٤) دامەزراندبوو، تا کاری خۆی لای شوورەوی پێ مەیسەرکات، چونکە لەگەڵ ئینگلیزدا لە کێشمەکێشی بەلاداخستنی کێشەی ویلایەتی موسڵ دا بوو، دۆڕاوی پاش جەنگ و پێویستی بە پشتگیریکەرێکی بەدەر لە هاوپەیمانان هەبوو.

ئەو پشتگیریکەرە سۆڤیەتە، دەوڵەتێکە کە پێش کۆتایی جەنگ، خۆی لەڕیزی هاوپەیمانان کێشاوەتەوە و پیلانەکانی لە قاوداون. خۆشی سەد و یەك کێشە و گرفتی نێوخۆی هەیە و لەگەڵ هێزە ئیمپریالیستەکاندا لە ململانێدایە. لەژێر تین و تاوی ئەو پەیوەندییە دۆستایەتییانەدا و بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ڕوسیای کۆمۆنیست، ناچارن ئاوها ڕەفتار بکەن. قەوانەشڕەی ئەتاتورکیان لێدەدایەوە و کوردیان بە داردەست و بەکرێگیراوی ئینگلیز و ڕۆژئاوا لەکەدار دەکرد، لەحاڵەتێکدا کە وێلسنی سەرەکوەزیرانی ئینگلتەرەش کورد بە (خەتەری هەمیشەیی میسۆپۆتامیا) نێودەبات، وەك نووسەر لە شوێنێکی دیکەی ئەم باسەدا، لە پەراوێزی ژمارە ٨٦ ی لاپەڕە ١٣٩ دا پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە.

پاش گەشتێکی چڕ و پڕ بە سەرجەم سیاسەتی سۆڤیەت لە ڕۆژهەلاتدا، نووسەر پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە چۆن شوورەوی لەسەرەتادا، یانی ساڵی ١٩٤٨ پشتگیریی تەواوتەواوی لەدامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل کرد، بەلاّم ئەوە بەزیانی شکایەوە، چونکە ئیسرائیل بووە پێگەیەکی ڕۆژئاوا و شوورەویش دوژمنایەتی عارەبی پێبڕا.

ئەوجا باسی سەرەتای هاتنە نێوەوەی سۆڤیەت بۆ ناوچەکە دەکات لەسەردەمی ناصر دا. یەکەم نیشانەی ئەو دیاردەیە، بە پەیماننامەکەی سێپتەمبەری ١٩٥٥ ی نێوان چیکۆسلۆڤاکیا و میسر دیاریدەکات، کە بەپێی ئەو پەیمانە چیکۆسلۆڤاکیا چەك بە میسر دەفرۆشێت. دوایش پشتگیریی

سۆڤیەت لە میسر، لەشەڕی کەنالی سوێسی ١٩٥٦ دا، کە دەروازەی سەردەمێکی نوێی بۆ شوورەوی ئاواڵە کرد.

لەگەڵ هاتنە نێوەوەی سۆڤیەت بۆ ناوچەکە لەسەردەمی ناصر دا، بۆ فەراهەمکردنی دەرفەتێکی چێترو جێپێ قایمکردنی زێتر، شوورەوی ناچار بوو بیرو ئیدیۆلۆژیی خۆی سەبارەت بە بیری ناسیۆنالیزم ڕاستکاتەوە.

سۆڤیەت لە سەردەمی ستالین دا، هەڵوێستێکی ڕەق و ناتێگەیشتووانەی بەرامبەر ناسیۆنالیزمی عارەبی بەتایبەت و ناسیۆنالیزم بەگشتیی هەبوو. تەنها بەبەدگومانیی ئەوە کە گوایە لەنێو ناسیۆنالیزمە عارەبەکاندا، موسوڵمانی تیژڕەویان تێدایە، تیۆریستەکانی سۆڤیەت، ناسیۆنالیزمی عارەبیان بە کۆنەپەرست لەقەڵەم دەدا.

کێشەیەکی دیکەی ئیدیۆلۆژیی ئەوە بوو داخۆ عارەب یەك نەتەوە پێکدەهێنن؟ لەبەر ڕۆشنایی بۆچوونەکانی ستالین دا، تیۆریستەکانی سۆڤیەت دەربارەی (گەلانی) عارەب دەدوان، بەڵام خۆیان لەقەرەی یەك نەتەوەی عارەب نەدەدا. ئەمە ڕێگەی لە تیۆریستەکانی سۆڤیەت دەبەستەوە، دان بەنەتەوەییەکانی عارەبدا بنێن، کە ئامانجی سەرەکییان یەکێتییەکی سەراپایی عارەب بوو. بەو پێیە کۆمۆنیستە ناوچەییەکانیش لەسەرەتای سەرهەڵدان و گورپەیداکردنی بیری ناسیۆنالیزمی عارەبیدا، ئەو بیرەیان بە کۆنەپەرست لەقەڵەم دەدا.

بەپێی بیرو بۆچوونی ستالین، ناسیۆنالیزم (نیشانە و سەرەتای سەرەتاتکێ و هاتنەکایەی توێژی بۆرژوایە، کە تازە قۆناغی فیۆدالیزمی بەجێهێشتووە).

تێڕوانینی سۆڤیەت و کۆمۆنیستانی عارەب، لەم بیر و بۆچوونەی تێنەپەڕاندبوو. هەرچەندە خرۆشۆف هەوڵێکی زۆری دا پۆزش و بیانوو بۆ هاوکاریی لەگەڵ هێزە ناکۆمۆنیستەکاندا داتاشێت، بەلاّم بێهوودە بوو.

لەسەرەتای ١٩٥٨ دا، کاتی پێکهاتنی یەکێتییەکەی نێوان میسر و سوریا، نە سۆڤیەت و نە کۆمۆنیستانی ناوچەکە پشتگیرییان لێنەکرد.

پاش کودەتاکەی ١٩٥٨ ی عێراقیش، هەڵوێستی کۆمۆنیستەکان و قاسمیش بەرامبەر یەکێتی عارەب، هەڵوێستێکی دژانە بوو. کاتی کودەتا خوێناوییەکەی ناصرییەکان لەعێراقدا (١٥)، کۆمۆنیستانی عێراق و سوریا و میسر دەنگی ناڕەزاییان لێهەستا، هەتا خرۆشۆف نامەیەکیشی بۆ ناصر نارد و داوای لێکرد کە زۆر لە عیراق نەکات بۆ چوونە ئەو یەکێتییەوە.

لە ١٩٦٣ دا حیزبە کۆمۆنیستە ڕەدووکەوتووەکانی سۆڤیەت، لە پراگ کۆنگرەیەکیان سازکرد و لەو کۆنگرەیەدا دانیان بەوەدا نا کە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی میللەتان گەر بەسەرکردایەتی کۆمۆنیستەکانیش نەبێت، دەشێت دار و دەستەی سۆسیالیست و پێشکەوتنخوازیان تێدابێت.

سەرەتای ١٩٦٤ ، لە کۆنگرەیەکی ئابووریی نێونەتەوەییدا، ڕوخساری تیۆرییەکی نوێ کێشرا و نێوی (ڕێبازی ناکاپیتالیستانەی جیهانی سێهەم) ی لێنرا. دانیش بە هێزە سۆسیالیستە ناوچەییەکاندا، وەکو هێزێکی پێشکەوتنخوازی نێزیك بە بیری مارکسیزم- لێنینیزم دا نرا. پارتە کۆمۆنیستەکانیش ناچارکران، بەو تیۆرییە ڕازیبن. ئەمە بووە هۆی

سەرهەڵدانی لێکترازان و کەوتنەوەی دووبەرەکیی لەڕیزی زۆر لە پارتە کۆمۆنیستەکانی ناوچەکەدا.

پارتە کۆمۆنیستە عارەبەکان بەم "داهێنانە" نوێیە ڕازیبوون و دانیان بە سۆسیالیزمی عارەبییدا نا و هەتا برێکیان هەندەك لەڕێکخراوەکانی خۆشیان تێکەڵی پارتە ناسیۆنالیستە عارەبەکان کرد. سۆڤیەت بەمە ئیدیۆلۆژییەکی نوێی هێنایەکایەوە و وای دەردەبڕی کەلە هەندێك وولاتدا دەبێت نێزیکترین هێز لە پرۆلیتاریای گەشەنەکردووی ئەو وولاتانەوە، جڵەوی ئەرکە مێژووییەکە بگرێتەدەست.

١٩٦٤، پارتی کۆمۆنیستی میسر خۆی هەڵوەشاندەوە تا لە سۆسیالیزمی ناصرییدا بتوێتەوە. پارتی کۆمۆنیستی جەزائیریش هەمان شەقاوی هەڵنا. سۆڤیەتێك کە تا سەرەتای شێستەکان دژی پەیوەستیی عێراق بوو بە یەکێتی سوریا و میسرەوە، ئەوجا هەوڵی سازکردنی یەکێتی نێوان میسر و عێراقی دەدا.

کۆمۆنیستە عێراقییەکان، خۆماڵیکردنی هەندە دەستگایەکیان لەلایەن عارفەوە، بە هەنگاوێکی هێجگار پێشکەوتنخوازانە نێودەبرد. (١٦)

ئەوجا سۆڤیەت ناچاری پینەوپەڕۆی دەلاقەی بیروبۆچوونیان بوو سەبارەت بە سوپا، چونکە پێشان ڕایان وابوو کە سوپا ئامرازی چینی دەستەڵاتدارە، ئێستاکەش زۆری هاوپەیوەندەکانیان ڕژێمی میلیتاریست بوون، کە لەڕێگەی کودەتاوە جڵەوی فەرمانڕەواییان وەدەستکەوتبوو. تیۆریستە سۆڤیەتییەکان ناچار قاڵبی تیۆرییەکی نوێیان دارشت. گوایە سوپاش هەمووجۆرە چین و

توێژاڵێکی تێدایه و هەندە گروپێکیان دەتوانن هەنگاوی پێشکەوتنخوازانه بنێن و برە گۆڕانکارییەکی ڕادیکالانەی کۆمەڵایەتیش بسازێنن.

لەوەش زێتر هەنگاو هەڵنرا و وا ڕادەگەیەندرا کە گوایە پارتە ناسیۆنالیستەکان تەنها نوێنەری چینی بۆرژوا نیین، بەڵکە نوێنەری جوتکار و هەتا ڕادەیەك نوێنەری چینی کرێکاریشن.

ئەم تیۆری و ڕاوبۆچوونە نوێیانەی سۆڤیەت بەرامبەر ناسیۆنالیزم و هێزە مێلیتاریستەکانی جیهانی سێهەم، دەتوانرێت بە بنج و بناوانی سیاسەتی زلهێزانەی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا دەستنیشان بکرێت.

ئەمانە بوونە ڕێگەخۆشکەر بۆ هاریکاریکردنی سۆڤیەت لەگەڵ بەعسی ناسیۆنالیزم لە سوریا و عێراقدا و پاشانیش لکانی پارتەکۆمۆنیستەکانی هەردوو وڵاتەکە بەو ڕژێمانەوە."

"میراتیی روسیای تەزاریی، کاریگەرێتییەکی زۆری لەسەر سیاسەتی سۆڤیەت بەرامبەر کورد و کەمەنەتەوەییەکانی دیکەی ڕۆژهەلاّت هەیە. ئامانجی سیاسی ڕوسیای تەزاریی و ڕوسیای سۆڤیەتی، لەگەلّ جوداوازییە ئیدیۆلۆژییەکاندا، هەندە لێکچوونێکیشیان هەیە. دوو هۆکاری گرنگسیاسەتی ڕۆژهەلاّتی تەزارەکانیان بەکێش دەکرد:

١-پێویستییەکی ستراتیژیانە، کە گەیشتنە زەریا گەرمەکان بوو، کوردستان پردێك بوو لە نێوان روسیا و ئەو زەریایانەدا. لە ململانێی سەدەکانی ١٨ و ١٩ ی زلهێزەکانی ئەو سەردەمەدا، ئەورووپاییەکان هەولّیاندەدا جێپێی خۆیان لە ئیمپراتۆرێتی عوسمانییدا بکەنەوە. ڕوسیاش هەولّیدەدا مەیلی کەمەنەتەوەییەکانی ئەو ئیمپراتۆرێتە بەلای خۆیدا ڕاکێشێت.

٢-لەسەدەکانی ١٨ و ١٩ دا، ڕوسیا چەند جارێك دژی دەولّەتی عوسمانی و ئێران جەنگا و بەشێکی ئەو وولاّتانەی داگیرکرد. لەو ڕێگەیەوە بەشێکیش لە کوردستان کەوتە ژێر دەستیانەوە، کە ماوەیەکی دوور و درێژ مەیدان و پێخوستی شەڕی ڕووسیا و دراوسێکانی بوو. ڕوسیاش باری نارەزایی کورد و کەمەنەتەوەییەکانی دیکەی ئەو ناوچانەی دەقۆستەوە و هەولّیدەدا بیانکاتە دۆستی خۆی. ئەمە هەمان سیاسەتە کە ئەورۆ سۆڤیەت لە وولاّتانی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا وەبەری دەگرێت."

ئەوجا نووسەر بە دوور و درێژی باسی پەیوەندییەکانی کورد و ڕووسیای تەزاریی دەکات، پاشان دەنووسێت:

"زیاد لە سەد ساڵ هێزە ئیمپریالیستەکان لە هەوڵی جێپێکردنەوەدا بوون لە ئیمپراتۆرێتی عوسمانیدا، کە کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانی دواییپێهێنا. ئینگلتەرە و فەرەنسا بەبەشێکی زۆر لە ئامانج و مەرامەکانی خۆیان گەیشتن.ڕوسیاش کە لەسەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، دەورێکی زۆری لەو تێکبەربوونەدا دیتبوو، دەستکەوتی زۆری بۆخۆی مسۆگەر کردبوو، بە شۆڕشی ئۆکتۆبەر کۆتایی پێهات. سەرکردەکانی کورد کە هیوای زۆریان لەسەر ڕوسیا هەڵچنی بوو، تووشی نائومێدی بوون. کەمێك پێش یەکەم جەنگ و لەکاتی جەنگیشدا، ڕوسیایان بە نێزیکترین دۆست دەزانی. هەموو ئەو هەولانەی بۆ زامنکردنی دۆستایەتی ڕوسیا دران، بەهەدەرچوون. لەو پەیمانە نهێنییانەش بێئاگابوون کە پاشەڕۆژیانی براندبووەوە. بەلاّم ئەو پێشهاتانە دەروازەی پەیوەندیی کورد و ڕوسیایان بۆ هێجگاریی سەرکلۆم نەکرد. لەلایەکەوە دەوڵەتی نوێی ڕوسیا ، پەیمانە نهێنییەکانی لەقاودا و خۆی لەبەرپرسیارێتی کێشەوە، لەلایەکی دیەوە بەکۆتایی جەنگەکە کورد کێشەی زێتری بۆ هاتەکایەوە، بۆیە بەناچاریی بەدووی دۆست و هاوپەیمانێکی دیکەی زلهێزدا وێڵ بوو.

دەستکەوتی سەدساڵ جەنگو کێشمەکێشی نێوان ڕوسیای تەزاری و هاوسێکانی و زلهێزەکان، ئەم میراتییانە بوون کە بۆ ڕوسیای سۆڤیەتی بەجێمان:

١-وەك ئاکامێکی جەنگەکانی سەدەی نۆزدەهەم، ڕوسیا توانی بەشێك لە خاکی کوردستان داگیربکات و بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، هەرچەندە پاشان

ڕوسیای سۆڤیەتی بەشێکی ئەو ناوچانەی بە تورکیا دایەوە، بەلاّم بەشێکی هەرلەژێر دەستی خۆیدا هێشتەوە و ئەوە ئەو بەشەی کوردستانە کە ئەورۆ کوردی سۆڤیەتی لێدەژین.

٢-لێکۆلّینەوەی زانستی دەربارەی کورد لەسەدەکانی نۆزدەهەم و سەرەتای ئەم سەدەیەدا، هەنگاوی زۆری بۆ هەلّنرا و پێشکەوتنی چاکی بەخۆوە دیت، ئەمە بووە بنەچەیەك بۆلێکۆلّینەوەی کوردەوانی لە سۆڤیەتدا و گرنگترین ئامرازی پەیوەندیی نێوان کوردەکانی سۆڤیەت و کوردی وولاّتانی دی.

٣-ڕوسیا لەو سەردەمانەدا، پەیوەندییەکی چاکی لەگەلّ هەندە خانەوادەیەکی خانەدان و دەستڕۆیشتووی کورددا بەست، وەچەکانی ئەو خانەوادانە زۆرجار بۆ ڕوسیای سۆڤیەتییش بەئەمەك مانەوە.

هەرچەندە شۆڕشی ئۆکتۆبەر کاریگەرێتییەکی زۆری لەسەر مەسەلەی کورد هەبوو، بەڵام مەیلی سۆڤیەت لەم سەردەمەدا لەجاران کەمتر بوو، یاخود تارادەیەك هەڵوێستێکی نەرێتیشیان بەرامبەر خەباتی کورد لەپێناوی سەربەخۆییدا ، هەبوو.

هۆکانی ئەو هەڵوێستەنەرێتییە ئەمانە بوون:

١-رژێمی بۆلشەفیك هەتا ١٩٢٠ یش بەزەحمەت دەیتوانی دەستەلاّت و حوکمی خۆی بەسەر ڕوسیای سۆڤیەتیدا بەرقەرارکات. شەڕی نێوخۆی مەنشەفیك و دوژمنەکانی دیکەی بۆلشەفیك، نەیاندەهێشت دەستەلاّتی سۆڤیەت بگاتە سنوورەکانی باشووری. مەسەلەی گرنگ بەلای سۆڤیەتەوە لەو کاتانەدا بەرقەرارکردنی دەستەلاّت و پاراستنی سنوورەکانی باشووری بوو. بۆیە سۆڤیەت دەیەویست بەهەر نرخێك بێت پەیوەندیی ڕەسمیی و ناڕەسمیی لەگەڵ هاوسێکانی خواروویدا ببەستێت.

٢-ڕوسیای تەزاریی، ژمارەیەکی زۆر لە میللەتان و کەمەنەتەوەیی ئێتنی و ئاینیی لە خۆیدا کۆکردبووەوە. سۆڤیەتی نوێ ناچاربوو لەو میراتەی تەزارەکان، یەکێتییەکی فرەنەتەوەیی بسازێنێت، کە گشت میللەتانی بگرێتەخۆ، نەك دەوڵەتێکی نیشتمانیی یەکپارچەیی. لەو ڕێگەیەوە مەسەلەی میللەتان و مافی سەربەخۆییان، بووە کرۆکی بیر و ئامانجی سیاسی ئەو دەوڵەتە و ڕێخۆشکەری بانگاشە و پڕوپاگەندەی سۆڤیەت لە دەرەوەدا. تایبەت لەئاسیادا، ئەو پڕوپاگەندانە کاریگەرێتییەکی زۆری لەسەر ئەو دەوڵەتە فرەنەتەوەییە هاوسێیانەی سۆڤیەت هەبوو کە بەدەست بەلاّی ئەو تەنگ و

چەڵەمانەوە دەیانناڵاند. مەسەلەکە بەتایبەت بۆ ئەو کەمە نەتەوەییانە گرنگ بوو، کەبەسەر ڕوسیا و ئەو وولاّتانەدا بەخشرابوونەوە، وەکو ئەرمەن و ئازەر و تورکەمەن و هەتا بەشێکیش لە کورد.

ئا لەو دەمکاتەدا سنووری نێودەوڵەتیی ئەو وولاّتانە تەواو نەچەسپی بوو. دان بەیەکدیدانانی دیپلۆماسییانەی هەردوو دەوڵەتی نوێی سۆڤیەت و تورکیا هێشتا لەبەردەم بڕیاردا بوو. بۆیە سیاسەتی سۆڤیەت هێشتا نەچەسپیو و نەمەییو بوو.

٣-خۆکێشانەوەی ڕوسیای سۆڤیەتیی پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە پەیمانی سایکس بیکۆ و سەرقاڵیی بەشەڕی نێوخۆوە، نەك تەنها ڕێگەی ئەوەی بۆ ئینگلتەرە و فەرەنسا خۆشکرد کە ببنە یەکە ئاغای ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست و نێزیك، بەڵکە بارێکی واشی بۆ ڕەخساندن کە لەو ناوچەیەوە، تایبەت لە ئێرانەوە، دەوڵەتی نوێی بەلشەفیك بخەنە بەر شالاّوی هەڕەشەوە و کۆمەك بە دوژمنانی بکەن.

٤-هەروەك سەردەمی کۆتایی و گیانەڵڵای ڕژێمی تەزاریی، مەسەلەی ئەرمەن بەلای دەستەلاّتی نوێی سۆڤیەتەوە، بایەخ و گرنگییەکی زێتری هەبوو لەمەسەلەی کورد. ڕەنگە مەسەلە ئاینییەکە لێرەدا و ئەو بەشە زۆر و فراوانەی ئەرمینیا لە سۆڤیەتدا، کایەیەکی زۆریان گێڕابێت. لەو کێشمەکێشەی خەباتی نیشتمانیی کورد و ئەرمەندا، سۆڤیەت زێتر پشتگیریی لەمەسەلەی ئەرمەن دەکرد و هەڵوێستێکی خراپی بەرامبەر مەسەلەی کورد هەبوو".

ئەوەی لێرەدا من بە پێویستی دەزانم پەنجەی بۆ ڕابکێشم، ئەوەیە کە ئەو هەڵوێستەی سۆڤیەت بەرامبەر کورد لە ١٩٤٦ یشدا تاڕادەیەك ڕەنگیدایەوە و دووبارەبووەوە، بێئەوەی مەسەلە ئاینییەکەش هیچ ڕۆڵ و کاریگەرییەکی هەبووبێت. ئەو کاتەش سۆڤیەت زێتر و بەرچاوتر پشتگیریی ماددی و مەعنەوی لە کۆماری ئازربایجان دەکرد وەك لە کۆماری کوردستان. هەوڵی زۆریش درا کەمەسەلەی کورد لە قەپیلکێکی تەسك بترێنجێندرێت و وەك بەشێك و پاشکۆیەکی مەسەلەی ئازربایجان حسێبی بۆ بکرێت و پابەندی ئەوکرێت. هەتا لەو بیرخەرەوەیەدا کە شوورەوی بە قەوام سەلّتەنەی دا و پاشانیش لەسەری ڕێککەوتن، لەخاڵی دووهەمدا تەنها باسی مەسەلەی ئازربایجان کرابوو، نەك کورد، کە دەڵێت: (دەربارەی مەسەلەی ئازربایجانی ئێران، کە کێشەیەکی نێوخۆییە و بە خودی ئێرانەوە پەیوەندییدارە، ئێمە پێشنیازی چارەسەرسازیی کۆمەلایەتی و ئابووری و کولتووری دەکەین). (١٧)

پاشان نووسەر گەشتێکی چڕ و پڕ بە هەڵوێستی سۆڤیەت بەرامبەر بە کورد دا دەکات و دەنووسێت:

"لە ٢٤ ی نۆڤەمبەری ١٩١٧ دا سۆڤیەت بانگەوازێك بۆ میللەتانی موسوڵمانی ڕۆژهەلات بلاودەکاتەوە، لەو بانگەوازەدا داوایانلێدەکات لەپێناوی ئازادیی و سەربەخۆییاندا دژی ئیمپریالیزم خەبات بکەن. لەو بانگەوازەدا نێوی ١٢ میللەت هێنراوە، بەلام نێوی کورد لەکوولەکەی تەریشدا نەهاتوو. هەرچەندە ئەرمەن موسوڵمانیش نیین، کەچی بەپەرەگرافێکی سەربەخۆ ئەوانیش بانگهێشت کراون. هەر لەو بانگەوازەدا سۆڤیەت دژی هەوڵەکانی

کەرتکەرتکردنی تورکیا دەوەستێتەوە، کەچی داوا لە ئەرمەن دەکات بۆ بەدەستهێنانی مافی چارەنووسی خۆیان خەبات بکەن، کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی دەگەیەنێت.

لە کۆنگرەی پاریسدا، وەفدی کورد داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی لەژێر چاودێریی یەکێك لە دەوڵەتەگەورەکاندا پێشچاوخست. سۆڤیەت نەیدەویست بار و دۆخەکەی کورد تێبگات، وەکو داردەستێکی ئینگلیز لە مەسەلەکەیی دەڕوانی. دینامیکێتیی خەباتی نیشتمانیی کوردی پێ قەبوڵ نەدەکرا. نەیدەزانی لەو بار و دۆخە سەخت و ئەستەم و دژوارەدا، کورد ڕێگەی دیکەی لەبەردەمدا نییە و ناچارانە پێشنیازی ئاوها پێشچاودەخات. لە نۆڤەمبەری ١٩٢٠ دا، ئەلیاس م. پاڤلۆڤیك، کە یەکێکە لە لێکۆڵەرەوە نێودارەکانی سۆڤیەت، ئا بەم شێوەیە دێتەگۆ: (شۆڕشێکی سۆڤیەتییانە لە ئەرمینیادا، پیلانەکانی ئینگلیز پووچدەکاتەوە کە گەرەکێتی دەوڵەتێکی کوردیی داردەستی خۆی، لەدژی ئێمە دابمەزرێنێت).

پاش یەکەم جەنگی جیهانیی، خۆراسان و ئازربایجان و گیلان، ناوچەی ڕاپەڕین و شۆڕشی دژ بە ڕژێمی ئێران بوون. ڕاپەڕینی گیلان، کە بە سەرکردایەتی (میرزا کوچککخان) بەرپاکرا و کۆمۆنیستانیش پشتگیریی تەواویان دەکرد و هەندەك هۆز و بڕێك جوتیاری کوردیش تێدا بەشداربوون، بەکۆمەکی سۆڤیەت کۆمارێکی لێدامەزرا و کوردێك بەنێوی (خالۆ قوربان) بووە وەزیری بەرگریی.

هەرچەندە سۆڤیەت پشتگیریی ڕاپەڕینی کوردەکانی خۆراسانیشی کرد، کەبە سەرکردایەتی (سەردار خوداوێردی) بەرپابوو، بەڵام ئەم پشتگیرییانە هیچ نرخ و بایەخێکیان لە هەڵوێستی سۆڤیەتدا بەرامبەر بەکورد نەبوو، چونکە:

١-لە گیلان کوردەکان بەشێکبوون لەو کۆمارەی کۆمۆنیستەکانیش تێیدا بەشداربوون.

٢-ڕاپەڕینی کوردانی خۆراسان، واتا و مەودایەکی نەتەوەییانەیان نەبوو، چونکە ئەو کوردانەی لەسەدەی هەژدەهەمەوە بۆ ئەوێ ڕاگوێزرابوون، لەمێژ بوو لە بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد داپچڕابوون و ڕاپەڕینەکەیان تەنها هەژان و هەڵچوونێکی مەڵبەندیی بوو.

٣-ئەو پشتگیرییانەی سۆڤیەت بۆ گوشارخستنە سەر ڕژێم و بۆ بەرپێگرتنی سیاسەتی ئینگلیز بوو لە ئێراندا.

لەیەکەم و دووهەم کۆنگرەی کۆمێنتێرن دا بە چاك و خراپ باسی میللەتێکی بەشخوراو و زۆرلێکراوی وەکی کورد نەکرا.

بەپێچەوانەی بانگاشەی سۆڤیەت خۆیەوە، کە گوایە پشتگیریکەری گەلانی ژێردەستە و زۆرلێکراوە، ڕوسیا ڕێککەوتننامە لەگەڵ هەردوو دەوڵەتی ئێران و تورکیادا مۆردەکات. لەو پەیماننامانەدا یەکپارچەیی خاکی ئەو وولاَتانەی چەندین نەتەوەی زۆرلێکراویان بە لوولەی تفەنگ تێیدا لەقاڵبدراوە، پارێزراودەبن.

کۆمۆنیستە ڕەدووکەوتووەکانی سۆڤیەت، هەوڵیاندەدا ئەو هەڵوێستە ناماقوولانە، بەجوداوازیی لێکدابڕانی سیاسەتی دەوڵەتی سۆڤیەت و پارتی کۆمۆنیستی شوورەوی و کۆمێنتێرن عەیبپۆش دەکەن."

هەڵتەقاندنی ئەم پینەیە پێویستی بە سەرنج و تێڕامانێکی چکۆلە هەیە:

جارێ ئائەم بانگاشەیە پێشئەوەی ڕاستکردنەوەی بارێکی لاریێت و کونبڕکردنی دەلاقەیەك، سووکایەتی پێکردنێکی گێلانەیە، لەبەرئەوەی لەیەکەم وولاتی چینی کرێکاردا، دەورو ڕۆڵی پارتی کرێکاران دەسڕێتەوە و جڵەوی ڕێبەرایەتی لێدەستێنێتەوە، کە زۆر لە ڕاستییەوە دوورە، چونکە سکرتێری گشتیی پارتەکە لەو وولاتەدا، سەروو گشت دەستەلاتێك دەکەوێتەوە. دیارە بەو پێیە پارتەکە نەخشەکێش و بڕیاردەری سەرجەم سیاسەتی نێوە و دەرەوەی وولاتەکەیە. یانی دەوڵەت ئامرازێکە بەدەست پارتە کۆمۆنیستەکەوە و لە بڕێك حاڵەتی بیرۆکراتییانەدا نەبێت، دەوڵەت و حیزب لێکهەڵنابوێردرێن.

دەربارەی کۆمێنتێرنیش، زۆریان هەوڵدەدا خەڵکیی تێبگەیەنن کە گوایە دەزگەیەکی سەربەخۆیە و لەژێر ڕکێف و دەستەلاتی دەوڵەتی شوورەوی و پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتدا نییە و پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش تەنها هەر ئەندامێکە لەو دەزگەیەدا و هەمان ئەرك و مافی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، یا ئێران، یا تورکیا، یا هەریەکێکی دی هەیە.

زۆری ویست تا خەڵکیی تێگەیشتن کە کۆمێنتێرن قورەچەورەیەکی دەستی سۆڤیەتە و بەڕادەیەك وابەستەی ئەوە، کە ستالینێك لەسەر خواستی دەوڵەتە

ئیمپریالیستەکان، لەسەردەمی دووهەم جەنگی جیهانییدا، لە بەرامبەر کۆمەکیاندا بە شووروویی، بەیەك چاوداگرتن هەڵیوەشاندەوە و دواتر دەزگەیەکی جاسووسیی لەجێگە دامەزراند بەنێوی کۆمینفۆرمەوە.

"تورکە کەمالییە ناسیۆنالیستەکان، دژی پلانی هێزە ئەوروپاییە سەرکەوتووەکان وەستانەوە، کە دەیانویست کەلاکی دەوڵەتی عوسمانیی لەنێوخۆیاندا بەشکەن. ئەو هەڵوێستە ڕێگەی پەیوەندیی و هاریکاریی نێوان تورکیا و ڕووسیای سۆڤیەتیی خۆشکرد. لەسەرەتای ۱۹۲۰ دا، سۆڤیەت پێشنیازی دانپێدانانی بەرامبەر و پەیوەندیی دیپلۆماسییانەی پێشکەش ئەتاتورك کرد. ئەتاتورك ڕازییبوو. (سۆڤیەت پشتگیریی لە خەباتی ئازادیخوازانەی ناسیۆنالیستانی تورك دژی ئیمپریالیزم دەکرد).

هەتا بەچەك وتەقەمەنیش کۆمەکی پێکردن. ئەو هاوکارییە گەیشتە ئەو ڕادەیەی لە مارتی ۱۹۲۱ دا پەیمانێکی دۆستایەتی و ئالیکاریی لەنێوان تورکیا و سۆڤیەتدا مۆرکرێت.

هەرچەندە کورد و عارەب و ئەرمەن لەو کاتانەدا زیرە و داد و فریادی مافی چارەنووسیان لێهەڵستابوو، بەڵام لەو پەیمانەدا هیچ باسێك لە مافی ئەو نەتەوانە نەکرا، بەڵکە ڕاشکاوانە گوترابوو: (سنوورەکانی تورکیا کە بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی نیشتمانیی تورکیا، لە ۲۸ ی ژەنیوەری ۱۹۲۰ دا دیاریکراوە، پارێزراو دەبێت).

بەو بڕیارە، کوردستان و ئەرمینیای شەتەکدراو بەدەوڵەتی عوسمانییەوە، بە تورکیای کەمالییەوە دەهێڵێتەوە.

لەخاڵی هەشتەمدا دەڵێت: (هەردوك ووڵات، بانگاشەی هەر گروپێك بۆ دابڕینی بەشێك لە خاکی یەکێك لەو ووڵاتانە، دەدەنە دواوە).

ساڵی ١٩٢١ پەیمانێکی دۆستانە لەگەڵ ئێرانیشدا مۆرکرا، کە خاڵی شەشەمی دەڵێت: (لە حاڵەتی هێرشی هێزێکی دەرەکیی دیکەدا بۆسەر ئێران ، گەر ئێران خۆی توانای بەدەرنانی ئەو هێزەی نەبوو، ئەوا ڕوسیا ناچارە، بۆ پاراستنی ئاسایشی خۆی، ئۆردوو بنێرێتە ئێرانەوە).

دیارە هەر بەپێی ئەم پەیمانە بوو، ڕوسیا لە ١٩٤١ دا لەشکری خۆی ناردە ئێرانەوە.

پەیمانی سیڤەری ١٩٢٠ لە خاڵەکانی ٦٢ و ٦٣ و ٦٤ دا گفتی ئەوە بەکورد دەدات، کە ڕێگەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی پێبدرێت. ئەمەش ئاوات و خواستی کورد بوو، کە لە ڕێگەی وەفدی کوردەوە پێشکەش بەو کۆنگرەیە کرا. بەلاّم کە سیڤەر بە لۆزان گۆڕدرا، هەڵوێستی سۆڤیەت هەمان هەڵوێستی ڕوسیای تەزاریی بوو بەرامبەر بە مەسەلەی کورد. پاشانیش لە سێپتەمبەری ١٩٢٠ دا سۆڤیەت بیرخەرەوەیەك دەداتە بەریتانیا و تێیدا دەڵێت: (حوکومەتی شووروەوی، پشتگیریی خەباتی میللەتی تورك دەکات. پشتگیریی هەوڵ و تەقەلای تورکیا دەکات بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەر، کە سەربەخۆیی و سەروەریی و یەکێتی خاکەکەی دەخاتە بەر مەترسییەوە. تورکیا لەو خەباتەیدا گشت میللەتانی ڕوسیای لەپشتە).

هەڵوێستی سۆڤیەت ئاشکراتر لەو بیرخەرەوەیەدا بەدەردەکەوێت کە وەفدی ڕوسی و ئۆکرانی و جۆرجی لە ٣٠ دێسەمبەری ١٩٢٢ دا پێشکەش کۆنگرەی

لۆزانی دەکەن. لەو بیرخەرەوەیەدا دەڵێن: (شەڕی تورکیا و ئەورووپاییەکان، بنەماکەی بۆ پەیمانی سیڤەر دەگەڕێتەوە، کە لەو پەیمانەدا هێزە ئەورووپاییەکان، خاکی تورکیایان تاڕادەی یەك لەسەر پێنج قارسکردووە و بەو پێیە چاوی چلێسی خۆیان تێردەکەن و ڕۆژهەلاتی ئەنەدۆل لەنێو خۆیاندا بەشدەکەن).

سەرەڕای هەموو بانگاشەیەکی ڕوسیای پشت و پەنای گەلان، لەو کۆنگرەیەدا بەتاقە ووشەیەك بەرگرییان لەماف و چارەنووسی کورد نەکرد، بەپێچەوانەوە دژیشی دەوەستانەوە.

کاتێکیش ئەورووپاییەکان دیتیان تورکیا واخەریکە بەتەواوی دەچێتە ئامێزی ڕوسیاوە، ئەوجا سیاسەتی خۆیان باپێدایەوە و هێمنانەتر و فێڵبازانەتر ڕەفتاریان دەکرد، تا ناچاری بارێکی وای نەکەن. ئالەو حاڵ و بارەدا، نەسۆڤیەت و نەهێزە ڕۆژئاواییەکان، هیچیان ئامادە نەبوون، لەپێناوی میللەتێکی کورد دا، ئیحتیمالی پەیوەندییەکی چاك لەگەڵ تورکیا و ئێراندا بخەنە غەرغەرەوە.

کە کۆمەڵەی گەلان لە ١٩٢٥ دا کوردستانی بەعێراقەوە جووتباقەکرد و مافی کورد و خواستی ئازادیخوازانەی میللەتەکەی ژێرپێ نا، ڕوسیای پارێزەری مافی گەلان، دژی ئەو ماف قووتدانەی نەتەوەیەك نەوەستایەوە، بەڵکە بەپێچەوانەوە، دژی ئەوە بەدەنگهات و جەرگی بۆ ئەوە ژانی دەکرد، کە گوایە غەدر لە تورکیا کراوە. (شێتشێرن) ی قۆمیسەری سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەت لە ٢١ ی دێسەمبەری ١٩٢٥ دا ئاوها بەرامبەر ئەو بڕیارە دێتەگۆ:

(ویلایەتی موسڵ بایەخێکی ستراتیژیانەی گەورەی بۆ تورکیا هەیە، کە لەم بڕیارەی ئێستادا پشتگوێخراوە، ڕەنگە ئەو بڕیارە لەسەر ئاستێکی ئینتەرناسیۆلانە، بارێکی زۆر ئاڵۆز بخوڵقێنێت).

لە ئۆکتۆبەری ١٩٢٤ دا، (شێتشێرن) پیرۆزبایی لە سیاسەتی مۆدێرنکردنی تورکیا و ئێرانی دۆستی دەکات. ئۆپۆزیسیۆن و نەیارە مەڵبەندییەکانیش بە کۆنەپەرست و دوژمن و بەربێگری پێشکەوتن نێودەبات.

لە گۆڤارەکەی کۆمێنتێرن دا، شۆڕشەکانی کوردی ساڵانی بیستیش، بە سەرەڕۆیی و سەرکەشی فیۆدالانی یاخی و کۆنەپەرستان و دوژمنانی پێشکەوتن دادەنرێن. هەر ئەم هەڵسەنگاندنانە بوو دواتر بوونە بنەما و پاشخانی سیاسەتی چەوت و چەوێڵی کۆمۆنیستانی خۆرهەڵات و زیانێکی زۆری پێگەیاندن.

جگەلەوە، کۆمۆنیستانی ناوچەکە پشتیان بەو پێناسەیەی ستالین دەبەست، کە ئابوورییەکی هاوبەشی بە یەکێك لە مەرجەکانی بوونە نەتەوە دادەنا. دیارە ئابووری هاوبەشیش تەنها لە چوارچێوەی سنووری یەك دەوڵەتدا دێتەکایەوە. ئەمە یانی ئەو گەلەی بێدەوڵەتە، نەتەوە نییە.

ساڵی ١٩٢٩ کۆمێنتێرن ڕەخنەی ئەوە لە چوار نوێنەری کوردی پارلەمانی عێراق دەگرێت، کە داوای مافی ئۆتۆنۆمییان بۆ کوردستان کردووە. هەرچەندە ئەوکاتە کوردستان بە عێراقەوە جووتباقەکراوە و عێراقیش کۆلۆنیی ئینگلیز بووە. کۆمێنتێرن لەهەمان جێدا دەڵێت: (بەریتانیا گەرەکێتی کوردستانێکی دژ بە تورکیا و سۆڤیەت، لەویلایەتی موسڵدا دروست بکات)".

"بۆ زێتر ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە تالانە، دەبینین لە سییەکان بەدواوە، کاتێك ئەو دەوڵەتانە جێپێی خۆیان قایمکرد و بەرژەوەندییەکانیان چەسپی و پشتیان لە سۆڤیەت کرد و چەندین پەیمانی دژە سۆڤیەتیان لەگەڵ بەریتانیا و هێزە ئەوروپاییەکاندا مۆرکرد، ئەوجا سۆڤیەت سیاسەتی خۆی باپێدایەوە و ڕەحمی تلیسایەوە و بیریکەوتەوە کە میللەتێکی بێدەرەتانی زۆرلێکراوی کوردیش هەیە. بۆیە هێدی هێدی سیاسەتی خۆی بەرامبەر گۆڕی. دیارە ئەمجارەش بە مەبەستێکی دیکە و لەپێناوی هەمان بەرژەوەندیی خۆیدا. ئەمجارە بۆ گوشارخستنەسەر و هەڕەشە و چاوزیتکردنەوە لەو وولاتانە."

لە لاپەڕە ١٧٤ دا، نووسەرهەڵسەنگاندنێکی سەیر پێشچاو دەخات، دەڵێت:

" ڕەنگە وەبەرگرتنی ئەو هەڵوێستانەی پێشوو، کەمیی زانیارییان بوو بێت دەربارەی کوردناسی و مەسەلەی کورد. ڕەنگە هۆیەکی دیکەی ئەو بێمەیلی و ناتێگەیشتنەی سۆڤیەت، ئەوەبێت کە لە ١٩٣٤ دا پارتی کۆمۆنیستی عێراق دامەزراوە و پارتە کۆمۆنیستەکانی دیکەش هێندە بچووك و کەمهێز بوون، کە نەتوانن هیچ کایەیەك لەنەخشەکێشانی سیاسەتی سۆڤیەتدا بگێڕن. کاربەدەستانی کۆمینتێرن کە خەڵکی ئەو ناوچەیە نەبوون، ڕەنگە هێشتا متمانەیان بە مەسەلەی کورد لا دروستنەبووبێ و ئەوان تێڕوانین و سیاسەتی سۆڤیەتیان بەدبین کردبێت".

نەخێر، قەت هەڵسەنگاندنی ئاوها ناچێتە عەقڵەوە. ئەمە بادانەوەیە لەڕاکانی پێشوو. نووسەر خۆی لە زۆر شوێندا پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە میراتییەکی هێجگار زۆر و زەوەندیان لە تەزارەکانەوە بۆ ماوەتەوە و بەشێکی

کارنامەکەی لەو بارەوە نووسیوە. ئەو ڕووداو و هەڵوێستانەی پێشان نووسەر شیکردوونەوە و پێشچاوی خستوون، هێندە زەق و ڕەقن کە بە سەد ڕەنگە و دەشێت، کاڵنەبنەوە و هەڵنەوەشێنەوە.

کۆمۆنیستی عێراق لە ١٩٣٤ دا دامەزراوە، خۆ کۆمۆنیستی دیکە لە ناوچەکەدا هەبوون. کۆمۆنیستی ئێران و تورکیا لە بیستەکاندا دامەزراون و پەیوەندییەکی توند و تۆڵیان لەگەڵ شووروەوی و کۆمینتێرن دا هەبووە. کۆمۆنیستی سوریا لە ١٩٢٨ دا دامەزراوە و مامۆستای کوردی هەرە هەرە پێشکەوتنخوان، خالید بەگداش، یەکێك لەدامەزرێنەران و ڕێبەرانی بووە. خۆ ئەو مامۆستایە خەڵکی ناوچەکە بووە و بۆ بەدبەختی بە تەسکەرە کوردیشە. کەچی ئەو دەمە لە حەوتهەمین کۆنگرەی ئومەمی شیوعیدا وەکی نوێنەری (ئوممەی عارەبی) و سەرۆکی وەفدی وولاتانی عارەب بەشداریی ئەو کۆنگرەیە دەکات. لەسەر بلندگۆی کۆنگرەوە ئاوها دێتەگۆ و لەسەر گەلانی بەشخوراو دەکاتەوە:

"وولاتە عارەبەکان کە زێتر لە ٦٠ ملوێن عارەبیان لێدەژی، بەشێوەیەکی دەستکرد و ناڕەوایانە بەسەر زێتر لە ١٢ وولاتدا بەشکراون و هێزە ئیمپریالیستەکان دەستیان بەسەرداگرتوون. ئەو وولاتانەش عێراق و سوریا و فەلەستین و ئەردەن و میسر و لیبیا و تونس و مەراکیش و..... ن سەرەڕای باری ناهەمواری ئەولەت و کوتییە هێشتا پەیوەندییە نەتەوەییەکە و زۆر داب و نەریتی هاوبەش و یەك خاکی هاوبەش، ئەو وولاتانەی توند پێکەوە گرێداوە.(١٨)

لەتەك ئەو دڵگەرمییەیدا بۆ میللەتێکی بەشخوراوی وەکی عارەب، کە کارێکی بەجێ و پەسەندە گەر بە ڕاستیبا، چونکە ئێمە باوەڕناکەین، کەسێك دڵی بۆ میللەتی خۆی ژان نەکات و مووچڕکە بەویژدانی لارەوە بوویدا نەیەت ، بتوانێت میللەتانی دی خۆشبوێت. نیوەی ئەو شین و گابۆڕەی بۆمیللەتە داماو و دیلکراو و بێچارەکەی خۆشی کردبا، ئەوجا هەرچی گوتبا قابیلی قەبوڵ بوو. بەلاّم دیارە هاوڕێیانیشی ئارەزووی بیستنی شتی بێتامی لەو بابەتەیان نەکردووە. جا ئەگەر (بیری زانستانە) ئا ئەوەبێت کەهەندێك تێیگەیون و مرۆ ئاوها نەزۆك بکات، ئێمە چمان لەدەست دێت لەوە زێتر کە لەگەڵ (بێکەس) ی هەرگیز زیندوودا بڵێینەوە: (مەرحەبا ئەی جەهل و وەحشەت، مەرحەبا).

جگەلەوە کە نووسەر دەڵێت: (کاربەدەستانی کۆمینتێرن خەڵکی ئەو ناوچەیە نەبوون)، گەرتاڕادەیەکیش ڕاستبێت، کە زۆربەی هەرەزۆریان خۆرهەلاّتیی نەبوون، بەلاّم خۆ لەمەریخەوە نەهاتوون، بەشێکی چاکیان خەڵکی وولاّتێك بوون کە پارچەیەکی کوردستانی دراوەتە دەم و دووڵای سنووریشی بەدوو پارچەی کوردستانەوە بەستراوە. چۆن دەچێتە عەقڵەوە ئاگاداری هەمووسرتە و خورتەیەکی ئەمریکای خواروو و ئەفریقا و قوتبی باشوور بن، کەچی گرمەی تۆپ و شریخەی گوللەی ژەندرمەی تورك نەبیستن و بێشەلاّنی گڕ و دووکەڵی جەنگەڵەکانی کوردستانی خۆرهەلاّت نەبینن و زایەڵەی زەنگی هاوار و هانای شێخی مەزن لەپەردەی گوێیان نەدات؟؟؟؟

سەرەڕای ئەوەش، دەبێت کاربەدەستانی کۆمینتێرن کەسانی زۆرکارامە و شارەزا و ئاگاداری بارودۆخی نێودەوڵەتان بن، چجای دراوسێکانیان.

کەواتە نەخێر، مەسەلە شتێکی دییە، گشت هەڵوێست و پەیوەندیی و هەڵسوکەوتێك لەپێناوی تاقە ئامانجێکدا وەبەرگیراون، بەرژەوەندیی وولاتێك کە نێوی سۆڤیەتە و لەسەر میراتی تەزارەکان کرکەوتووە، بە گشت کەوشەن و سنوورە کۆنەکانییەوە.

"کۆتایی دووهەم جەنگی جیهانیی، گۆڕانێکی دراماتیکانە بوولەو سیاسەتەی سۆڤیەتدا بەرامبەر بەکورد، کە کەمێك پاش جەنگ لەدامەزراندنی کۆماری مەهاباد دا، بەکۆمەکی سوپای سوور خۆی نواند.

دەربارەی کۆماری کەمتەمەنی مەهاباد، کە بەکۆمەکی شوورەوی دامەزرا و بەکشانەوەی رووخا، گەلەك راوبۆچوونی دژبەیەك هەن، کە زۆربەیان یەك لۆنە و تیشککخەرە سەر لایەنێکی مەسەلەکەن.

هێزە رۆژئاواییەکان وایلێکدەدەنەوە کە ئەو رووداوە، شەقاونانێکی سۆڤیەت بوو بۆ خزانە ئاسیاوە. رژێمی ئێران و ناسیۆنالیستانی فارس بە شالاوێکی سۆڤیەتی تێدەگەن، کە گوایە ویستوویە لەرێگەی بەکرێگیراوانییەوە، پارچەیەك لەخاکی ئێران داپچرێت.

رەخنەگرانی دژەستالین و کوردە هیوارماوەکان، بەکلاوبازییەکی سۆڤیەتی تێدەگەن، کە پاشان چارەنووسی کۆمارەکەی بە یەکدوو گالۆن نەوت ئاڵ و وێڵکرد.

ئەم هەڵسەنگاندنانە یەکلایی و سەرپێیین و تەنها لایەنێکی راستیی مەسەلەکە یەکالادەکەنەوە. بۆ تێگەیشتنی راستەقینەی مەسەلەکە، دەبێت ئەو گۆڕانکارییانەی لە ململانێی هێزە زەبەلاحەکاندا بەهۆی دووهەم جەنگەوە هاتنەگۆڕێ، هەروەها ئەو هەراشبوونەی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد کە هاوکاریی سۆڤیەتی رەخساند، تەواو شیکەینەوە.

لەپاڵ کۆمەکی ڕاستەوخۆ و تاڕادەیەك گردەبڕی سۆڤیەتدا، پێشهاتەکانی کۆماری مەهاباد زادەی گەشەکردنە ئاساییەکەی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد بوو.

سۆڤیەت کە وەك زلهێزێکی پلەدوو بەشداریی جەنگی کرد، وەك زلهێزێکی پلەیەك لێیخەلەسی. ئەمە وایلێکرد بەشێوەیەکی بەرچاوتر مشەی بەرژەوەندییەکانی لە ڕۆژهەلاتی نێوەندا بکات، وەك لەسەردەمی نێوان دوو جەنگەکەدا. لە کاتی جەنگدا، پەیوەندیی خۆی لەگەڵ بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد دا گرێدابوو. ئەمەش بۆ جێپێ قایمکردنی چارەنووسی نادیاری پاش جەنگ بوو.

هاریکاریی سۆڤیەت لەگەڵ کورد دا، ناتوانرێت لەگەڵ بوونی سۆڤیەت لە ئەورووپادا بەراورد کرێت. لە ئەورووپادا پارتە کۆمۆنیستەکان و بەرەی میللی هەبوون، کە هاریکاریی سۆڤیەتیان دەکرد، بەلام لە کوردستاندا نە پارتێکی کۆمۆنیست هەبوو، نەهێزێکی سەربە بیرو ئیدیۆلۆژیی سۆڤیەت، بەڵکە کۆمەڵێك سەرکردەی میللی، کە تاڕادەیەك سۆڤیەتیان بەتاقەهیوای کورد دەزانی. جگەلەوە سۆڤیەتیش هەڵوێستی خۆی گۆڕی بوو، ئالیکاریی پارتە ناکۆمۆنیستەکانیشی دەکرد.

عەودالیی سۆڤیەت بەدووی هاوکارێك لەو ناوچەیەدا، تەنها ترس و دڵەڕاوکەی تین و تاوی نازیی نەبوو لە ئێران و تورکیا دا، وەکو بیانووی ڕەسمیی هێرشەکردنە ئێرانی ١٩٤١ یان ڕایدەگەیاند، بەڵکە ئەو ڕاستییە بوو، کە ئەو ڕژێمانە لە بیستەکاندا دۆستی سۆڤیەت، یاخود بەلای کەمەوە بێلایەن

بـوون، بـەلاّم لەسـییەکاندا سـەریەبەرەی ڕۆژئـاوا بـوون و لەپەیمانـە دژە سۆڤیەتەکاندا بەشداربوون".

ئەوجا نووسەر گەشتێکی پێویست بەگشت ڕووداوەکاندا دەکات، چۆنیەتی دامەزرانـدنی کۆمەڵـەی ژ.ك و پاشـان پـارتی دێمـوکرات و دەورو ڕۆڵـی لـە پێشخـستنی مەسـەلەکەدا و پەیوەنـدیی لەگـەڵ دەوڵـەتی شـوورەویدا و هـەوڵی دامەزراندنی کۆماری کوردستان و کایەی پێشەوا لەو ڕووداوانەدا، شیدەکاتەوە. هەوڵـدانی شـوورەوی بـۆ پێبەنـدکردنی کۆمـاری کوردسـتان بـە کۆمـاری ئازربایجانەوە و پێشاندانی وەکو پاشکۆیەك و بەشێك لەو کێشەیە و هۆکـانی دیارییدەکات.

ئێمـە لێرەدا بە پێویـستی نـازانین ئەوانـە هـەمووی بـۆ خوێنـەر ڕاگـوێزین، چونکە زۆریان لەبارەوە نوسراوە و گوتراوە، گرنگ بۆ ئێمە هەڵوێستی شوورەوییە بەرامبـەر بـەو ڕووداوانـە، بـۆ ئـەو دوو کۆمـارەی دامەزرانـد و بـۆ پاشـان دەسـتی لێبەرهەڵدا کردن؟ ئایا مەسەلە تەنها گوشار و زۆربۆهێنـانی ئـەمریکا و ڕۆژئـاوا بوو وەکو هەندێك واینیشاندەدەن؟ یاخود مەسەلە تەنها دەستخستنی نـەوت بـوو وەك دژەکـانی ڕای پێشوو بەدڵنیاییـەوە دەیڵـێن؟ یـاخود ئەوانـە هـەمووی و هەندەك هۆکاری دیکەش ڕێگەی ئەو نەهامەتییـەی کـورد و ئازەریـان خۆشکرد و ئەو هەڵوێستە چاوەڕوان نەکراوەیان بەسۆڤیەت وەبەرگرت؟

ئێمە یەکەیەکە ئەو هۆکارانە شیدەکەینەوە و هەوڵدەدەین هۆکارێکی دیکـەی گرنگیش پێشچاوخەین:

١-بە ئاگاهێنانەوەکەی ئەمریکا و گوشاری هێزە ڕۆژئاواییەکان:

کاك فازڵ له لاپەڕە ٢٠٢ دا دەنووسێت: "کە سوپای سوور، ئۆردووی ئێرانی لەسەر ڕێگەی ئازربایجان ڕاگرت، ئەمریکا و ئینگلتەرە ناڕەزایی خۆیان دەربڕی. ئەمریکا ویستی لەڕێگەی دیپلۆماسییەوە سنوورێك بۆ دەستەلاتی سوپای سوور لە ئازربایجاندا دابنێت. بەلاّم ستالین ئامادە نەبوو گوێ بۆ داوای ئاوها شلکات و دەمەتەقێی لەسەربکات."

زۆر ڕاستە، ئەوکاتە سەرەتای سەرهەڵدانی مەسەلەکە بوو، شوورەوی تازە بازییەکەی دەستپێکردبوو، بۆیە هێرشی سوپای ئێرانی بۆسەر ئازربایجان، لە شەریف ئاباد ڕاگرت و ڕێگەی دەستدرێژیکردنە سەر کۆماری ئازربایجانی لێگرتن. چ باکێکی لەناڕەزایی ئەمریکا و ئینگلتەرەش نەبوو، هەتا ئامادەنەبوو گفتوگۆشی لەبارەوە بکات!

بەلاّم پاشان دەبینین زەندەقی لە بەئاگاهێنانەوەی ئەمریکا دەچێت و خێرا پشتی هەردوو کۆمارەکە بەرهەڵدا دەکات و سوپای خۆی دەکێشێتەوە!

باشە شوورەوی ئەمجارەیان چ ترسێکی لەو بەئاگاهێنانەوەیەی ئەمریکا هەبوو؟ دەقی بەئاگاهێنانەوەکە چ بوو؟ ئایا هەڕەشەی بەرپاکردنی جەنگبوو لە دژی شوورەوی؟ یا هەڕەشەی پساندنی پەیوەندیی دیپلۆماسییانە بوو؟ یا بە فیشاڵی هەندەك کۆمۆنیست گوایە بە بۆمبای ئەتۆم لە شوورەوی دەدا؟

نەخێر! ئەوانە هیچیان نەبوو، بەڵکە ئەمریکا شوورەوی بە ئاگاهێنایەوە، گەروەکو هەرسێ وولاّت، ئێران و ئینگلتەرە و شوورەوی ڕێککەوتوون، شوورەوی هێزەکانی خۆی نەکێشێتەوە، ئەوا ئەمریکاش لەشکر دەنێرێتە باشووری ئێرانەوە. یانی بارێکی وەك سەردەمی جەنگ دەهاتە ئاراوە، بارێکی وا کە لە زۆر

وولاّتانی دیکەی ئەوسەردەمەدا هاتبووە گۆڕێ، وەکو ئاڵەمانیا و نەمسا. لە ئاڵەمانیادا، ئەوبارە هەتا ئەوڕۆکەش بڕیکردووە و هەر بەردەوامە.

ئەوەتا جۆرج ئالنی باڵوێزی ئەو دەمەی ئەمریکا لە تاران، کە بەگوتەی شا خۆی، یەکێك بووە لە دۆستە ڕاستەقینەکانی ئێران، پشتیوانیی تەواوی دەوڵەتی ئەمریکای بۆ ئێران دەربڕیوە، بەلاّم ئاشکرا و ڕوون بە شای گوتووە: (ئێمە ئامادەنیین لەسەر ئێران، لەگەڵ شووریدا بەشەڕبێین). (١٩)

ئیدی دەبێت شوورەوی چ ترسێکی لەوە هەبێت کە خۆی بەشێکی ژووروی ئێرانی لەژێر دەستدا بێت و بەشێکی خواروشی لەژێردەستی ئینگلیزدا بێت، ئەمەریکاش لەقۆڵی باشوورەوە خۆی تێترنجێنێت؟ ئایا شوورەوی هێندە دڵی بە ئێران دەسووتا کە دەستبەرداری هەموو بەرژەوەندییەکانی بێت، بەومەرجەی ئەمریکا میللەتی کلۆڵی ئێران ژێردەستە نەکات؟

لە ڕاستیدا شوورەوی بۆیە ملیدا و ترسی لەو هاتنەی ئەمریکا پەیداکرد، چونکە پێیوابوو، گشت بەرژەوەندییە سیاسی و ئابووریەکانی لەڕێگەی گوشاری حیزبی تودە و هەڵوێستی تێگەیشتووانەی! قەوام سەڵتەنەوە بە هێمنانە و بێ دەردیسەر دەچەسپێت و ئیدی پێویست ناکات سەر و کەللەی ملۆزمێکی بەدفەسسالی وەکی ئەمریکا لەئێرانیشدا لەبەردەمیدا قووتبێتەوە و ببێتە شەریکە بەش. ئەوکاتانە حیزبی تودە تاکە پارتی ڕکەبەری خاوەن جەماوەر بوو. بەلاّم وەك کاك فازڵ بەهەڵە لە لاپەڕە ١٨٩ دا نووسیویە گوایە لە هەڵبژاردنەکانی دەورەی چواردەهەمی پارلەماندا یەك لەسەر پێنجی دەنگەکانی بەدەستهێناوە، وا نییە. حیزبی تودە تەنها هەشت نوێنەری لە

پارلەماندا هەبوو. بۆنموونە لەشارێکی وەکی تاراندا، کە بنکەی ڕاستەقینەی دەستەلاتی تودە بوو، لەو هەڵبژاردنەی پارلەماندا، سەریاکی دەنگەکان ٤١٣٤٦ دەنگ بووە، دوکتۆر یەزدی کە لە گشت پالێوراوەکانی تودە، دەنگی زێتری پێدراوە، تێکڕا ٤٧١٩ دەنگی هەبووە ، کە دیارە ئەوە لە هەشت یەکیش کەمتر دەکات. (٢٠)

بەهەرحاڵ تودە هێزێکی حسێب بۆکراوی هەبوو، جگەلەوە شوورەوی لە هەڵوێستی ڕێوی بازانەی قەوام گەلەك گەشبین بوو، پێیوابوو مادام قەوام دژی سیاسەتی ئینگلیز دەوەستێتەوە، ئیدی دۆستی ئەوانە، یاخود خۆشی واینیشاندەدا و حیزبی تودە و شوورەویشی تەواو تەواو خۆشبین کردبوو. ئەوەتا دوکتۆر ئەنوەر خامەیی کە یەکێك بوو لە ڕێبەرانی بەرچاو و نووسەرێکی لێهاتووی ئەو دەمەی تودە، لە بیرەوەرییەکانیدا بۆماندەگێڕێتەوە: (قەوام بە زیرەکی و کارامەییەکی تەواوەوە هەوڵیدەدا پشتیوانیی ڕێبەرانی تودە بۆخۆی مسۆگەر بکات. سیاسەتی دژە ئینگلیزی قەوام، ڕێبەرانی حیزبی تەواو گەشبین کردبوو. خۆشی سەرکردەکانی تودەی وەکی ئەسکەندەریی، دوکتۆر یەزدی، ڕۆستا، دوکتۆر ڕادمەنش و تاڕادەیەك دوکتۆر کشاوەرزیشی فریو دابوو، گفتی ئەوەی پێدابوون کە حوکومەت تەسلیمی ئەوان دەکات. ئەو کۆمەکانەی لە هەڵبژاردنەکانی دەورەی چواردەهەمدا بەهەندەك لەوانەی کردبوو، دەیکردە بەڵگە و دڵنیای دەکردن کە لەدەورەی پازدەهەمدا زۆربەی مەجلیس مسۆگەرە، ئەوانیش بەردەوام کاربەدەستانی شوورەوییان لە قەوام خۆشبین دەکرد. ئەو گەشبینییەی ڕێبەران گەیشتە ڕادەیەك کە لەتەواوی حیزبدا ڕەنگبداتەوە و لای

خەڵكییش سەریكات. بۆیە خەڵكیی سەركەوتنی قەوامیان بەسەركەوتنێكی گەورەی سیاسەتی تودە و شوورەوی حسێب دەكرد. ئا ئەو گەشبینییە بێبنچینەیە، گەورەترین ڕێگەخۆشكەری شكستی سیاسەتی شوورەوی و حیزبی تودە بوو). (٢١)

دەنا ڕەنگە ئەو بەئاگاهێنانەوەیەی ئەمریكا، لەسەردەمی دەستەلاتی حەكیمی، یا سەیید زییاء دابا، شوورەوی چ باكێكی نەبا و هیچ بایەخێكیشی پێنەدابا.

ئاشكرایە لەو دەمەدەمی بەركولەی گفتوگۆی قەوام و سادتشیكۆفدا، ئەو بەئاگاهێنانەوەیە بێتین و تاو نەبوو، شوورەوی ناچاركرد پەلە و دەستوبرد لە مەسەلەكەدا بكات، چونكە ترسی ئەوەی هەبوو تەڵەكەی پووچ بتەقێتەوە و گۆمی هێمنی بەرژەوەندییەكانی لێبشڵەقێنن.

ئا ئەوەبوو ترسی ڕاستەقینەی شوورەوی، نەك وەك هەندێك ڕایدەگەیەنن، گوایە ترسی بەرپابوونی جەنگێكی جیهانیی دیكەی هەبووبێت.

٢-مەسەلەی ئیمتیازی نەوت، ئایا بەلای شوورەوییەوە مەسەلەیەكی گرنگو جەوهەری بوو؟

یەك پرسیاری زۆر سادە و ڕەوان، كە من تا ئێستا لەهیچ نووسینێكی بەر لەمەی خۆمدا نەمدیتووە، سەری گلۆڵەی مەسەلەكەمان لەوەرامەكەیەوە دەكەوێتە چنگ. بەشیكردنەوەیەكی بارە سیاسییە مێژووییەكە، مەبەستی سەرەكیمان بۆ دەكاتە هێلكەی پاككراو و هیچ منگەمنگێك پێی لێفەپۆش ناكرێت.

پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا بۆچی شوورەوی لەو هەموو ساڵانەی جەنگدا ڕێگەی کورد یا ئازەریی نەدەدا بانگی ئۆتۆنۆمی، یا سەربەخۆیی خۆیان هەڵدەن؟ سەرەڕای ئەو هەموو کۆششەیان، تایبەت کورد، لەهەموو بۆنە و پێککگەیشتنێکدا لەگەڵ لێپرسراوانی شوورەوی، ئەو داواکاریانەیان پێشچاودەخست. بەلاَم ئەوان هەر دەیانگرتن بەدەمەوە و بە (جارێ کاتی نەهاتووە) ژێریاندەکردنەوە. کەچی لەپڕێکدا، ئا لەو دەمەدەمی کۆتایی جەنگەدا، ئەو هەڵوێستەیان وەبەرگرت؟

پێموایە پرسیارێکی بەجێیە و وەرامێکی بەجێشی گەرەکە. بۆیە هەوڵدەدەم بەکورتی بارەکە شیبکەمەوە و بۆ خوێنەری ڕوونبکەمەوە:

وەك ئاشکرایە سوپای شوورەوی لە ئۆگوستی ١٩٤١ دا هێرشی کرد و چووە ئێرانەوە. هەرلەسەرەتاوە هەوڵی ڕایەڵکردنی داوی پەیوەندییەکی چاکی لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ناوچانەدا دا. ئەو هێرشە بەپێی ڕێککەوتننامەیەك بوو لەگەڵ ئینگلیزدا. بەو بیانووو مەبەستەی بەربە شیمانەی شالاوێکی ئالەمانیا بگرن، گەر بیەوێت لەقوڵی باشوورەوە، شوورەوی گەمارۆ بدات. هەردوو وولاَت لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون، کەدەست لەکاروباری نێوخۆی ئێران وەرنەدەن و یەکپارچەیی خاکەکەی بپارێزن و پاش جەنگیش هێزەکانیان بکێشنەوە.

کاریگەرێتی ئەو پەیمانە بە جۆرێك بووە، کە دوکتۆر ئەنوەر خامەیی لە بیرەوەرییەکانیدا دەربارەی دامەزراندنی حیزبی تودە لە ١٩٤١ دا، ئاوهامان بۆدەگێڕێتەوە:

(ئەسکەندەری و نوشین پەیوەندیی بە باڵوێزخانەی شوورەوییەوە دەکەن، پێشینەی کۆمۆنیستانەی خۆیان ڕووندەکەنەوە، داوادەکەن ڕێگەیان بدەن حیزبێکی کۆمۆنیست دابمەزرێنن. بەلاّم بەپێچەوانەی چاوەڕوانیی خۆیانەوە، داواکەیان دەدەنە دواوە و ڕێگەیان نادەن. ئەو دەمانە ڕەزا ڕۆستا لە دوورخراوەیی دەگەڕێتەوە، کەمەسەلەکە لە ئەسکەندەری دەبیستێت، دەڵێت من ودمی دامەزراندنی وەردەگرم. دەچێتە باڵوێزخانەی شوورەوی و ئەوانیش بەم مەرجانە ڕێگەیان دەدەن:

١-دەبێت پارتێکی ڕەسمیی و قانوونی بێت. یانی نەك تەنها بەگفتار، بەڵکە دەبێت بە کرداریش، ملکەچ و گوێڕایەڵی یاسا بنجییەکانی سەڵتەنەت و مەشروتییەت بێت.

٢-دەبێت بەهیچ شێوەیەك توخنی بیری مارکسیزم و کۆمۆنیزم نەکەوێت و هیچ ڕەفتارێکی وا نەنوێنێت کە دەریبخات سەربەو ڕێبازە ئیدیۆلۆژییەیە.

٣-لەسەرئاستی سیاسەتی جیهانیی، پشتیوانیی هێزە هاوپەیمانەکان و دوژمنێکی سەرسەختی ئاڵەمانیا و ئیتالیا و ژاپۆن بێت. پارێزگاریی تەواو لە هەڵوێستی هاوپەیمانان، شوورەوی و ئینگلیز و ئەمریکا دەکات. دیارە دەبێت زێتر پشتی شوورەوی بگرێت، بەلاّم بە هیچ جۆر ڕەخنە لە هاوپەیمانەکانی ناگرێت و هێرش ناکاتەسەریان.

٤-تا دەتوانرێت کەسانی نێودار و ناسراو و بەشۆرەت کۆکرێنەوە.

٥-نابێت جموجۆڵی حیزبەکە هیچ زیانێك بەبەرژەوەندییە ئابووریەکانی وولاّتانی هاوپەیمان بگەیەنێت، تایبەت لەو کارخانە و شیرکەتانەدا کە خزمەت

بـه هاوپـەیمانان دەکـەن، وەك کارگـەکانی چەکسازی و شیرکەتەکانی نـەوت. نابێـت لـەو شـوێنانە سـەندیکای کرێکـاران دامـەزرێنن و داواکـاریی کارگـەران پێشچاوخەن، یاخود مانبگرن. (٢٢)

یـانی حیزبێکـی لیبرالانــە دابمــەزرێنن ولــە گـشت چــین و توێژاڵــەکانی تێبئاخنن.

دیـارە شـوورەوییەك ئـا بـەو ماتـە مـات و تـرس ولـەرزە و ئابـەوشـێوە و شـێوازە ڕێگـەی دامەزرانـدنی پـارتێکی کۆمۆنیستی وابەسـتەبەخۆی بـدات، ئـەوا ڕێگـەی سەرەڕۆیی و زێدەڕەوی بەهیچ هێزو گروپێکی ناوچەی دەستەلاتی خۆی نادات.

بۆ؟

ئەوکاتانە شوورەوی لەبەردەم هەڕەشەی شالاوی سوپای ئاڵەمانیای نازییدا بوو، لارەمل و چاولەدەستی کۆمەکی سـوپایی و ئـابووری ئـەمریکا و ئینگلیز بـوو، بۆیـە نەیـدەتوانی سەرپێـچی لـەو پەیماننامـە ڕەسمییـە مۆرکراوانـە بکـات. هـاو پـەیمانان کۆمـەکێکی بەرچەسـتە و بەرچـاویان بەشــوورەوی دەکــرد. ڕۆژانــە لەبەندەر عەبباس ژمارەیەکی بێئەندازە پاپۆڕو گەمێی بارکێش دەوەستـان، کە چـەك و تەقەمەنیی و تـۆپ و زرێپـۆش و شـەمەندەفەر و فـارگۆن و لـۆری و فرۆکـە و کۆمـەکی دیکـەی ئـەمریکی و ئینگلیزییـان بـە شـەمەندەفەر بـەرەو سـۆڤیەت دەگواستەوە. (٢٣)

جگەلـەوە، زۆربـەی کارخانـەکانی چەکسازیی ئێـران، بەرهـەمی خۆیـان بـۆ شـوورەوی بەڕێـدەکرد. بـەهۆی ئـەو بـارە ئابووریـیـە خراپـەوە کـە جـەنگ لـەوێ

خولْقاندبووی، زۆربەی هەرەزۆری بەرووبوومی کشتوکاڵیی باکووری ئێران بۆ ئەوێ دەنێردرا.

ئالەوحاڵوبارەدا، ستالین نەیدەتوانی لە گفت و بەڵێنی خۆی پەژیوان بێتەوە و دەست بەخێری خۆیەوە بنێت. جگەلەوە، ئەو کاتە ستالین پێیوابوو لەرێی دلْراگرتنی چینی دەستەلاتداری ئێرانەوە، دەتوانێت جێپێی خۆی لە ئێراندا بکاتەوە. (٢٤)

لە نۆڤەمبەری ١٩٤٣ دا، کاتێك کۆنفرانسی تاران گیرا، بە پێچەوانەی رۆزفلت و چەرچڵەوە کە شا دەچێتە سەردانیان، ستالین خۆی دەرواتە خزمەتی شا. لەحاڵ و بارێکدا کە ئەوسێ کەڵەپیاوە، هێند ترسیان لە پیلانێکی ئاڵەمانیی دەبێت دەستبکێشێتە گیانیانەوە، لەنێوان باڵوێزخانەکان و شوێنی حەواندنەوە و کۆبوونەوەدا، تونێلی ژێرزەوییان لێدابوو بۆ هاتوچۆ.

ستالین بێ پاسەوان و یاساوڵ خۆ دەگەیەنێتە دەرباری شا، تەنها ماکسیمۆف و مۆلۆتۆفی وەزیری دەرەوە لەگەڵ خۆی دەبات. گەلەك بە تامەزرۆیی و دلگەرمییەوە دەستی شا دەگوشێت و توند توند لە ئامێزی دەگرێت. لەو دانیشتنەدا گفتی ژمارەیەك زرێپۆشی ت٣٤ و چەند فرۆکەیەکی جەنگیی بە شا دەدات. (٢٥)

بۆیە هەر لەسەرەتاوە کاربەدەستانی شوورەوی ، جەمسەری پەیوەندیی دۆستایەتییان لەگەڵ هێزە مەڵبەندییەکاندا دەبەست، دلْیانرا دەگرتن و گدیگدی هەستی نەتەوایەتییان دەدان، تا لایەنگیرییان مسۆگەربکەن. چونکە چارەنووسی شەرِ هێشتا نادیاربوو. هەڵبەت لە حاڵەتی پێویستیی و خەتەردا،

لایەنگیریی و دۆستایەتییان، سوودی چاکی بەرهەم دەهێنا. دیارە ئەو کاتانە ڕێگەی ئەوەیان نەدەدان هیچ هەنگاوێك هەڵنێن کە هاوپەیمانان دردۆنگ بکەن. بەلاّم کاتێك سەرئەنجامی شەڕ هێدی هێدی ڕوونبووەوە و شکاندنی هێزی چەپەڵی نازیی و سەرکەوتنی هاوپەیمانان ئاشکرا بوو، ئیدی شوورەوی کەوتە بارودۆخێکی دیکەوە. ستالین وەك پاڵەوانێك و سەرکەوتوویەکی جەنگ هاتە مەیدانی تالاّنکارییەوە. شوورەوی ڕێی ئەوەی بۆخۆشبوو وەك دەوڵەتێکی زەبەلاح و خاوەن هێز بێتە سەر شانۆی سیاسەتی جیهان. بۆیە ستالین چیدی بەو لارەملی و زەلیلی و چاولەدەستییەی جاران هەڵسوکەوتی لەگەڵ هێزی زەبەلاحی بەریتانیای مەزن و هێزی تازە پێداکەوتووی ئەمریکا نەدەکرد، بەڵکە ئیدی لەو مەنتیق و عەقڵییەتەوە ڕەفتاری دەکرد کە وولاّتێکی سەرکەوتووە و بە زیان و قوربانییەکی زۆرەوە لە جەنگ خەلەسیوە و لووتی هێزی ڕووڕەشی نازیی لەبەرد داوە و پاداشتیشی گەرەکە.

لە ئەورویا لەشکری سوور، هەتا چ سنوورێك ئۆردووی نازیی هەڵبڕی، بەکەوشەن و سنووری دەستەلاّتی سۆڤیەت مایەوە. ئەو نەخشەکێشانەی ئەو دەمەی ئەورویا، هەتا ئەورۆکەش بەو شێوەیە هەر بەردەوامە. ئوتریشی لێدەرچێت کە لە ١٩٥٥ دا لەشکری سوور لەو بەشەی داگیری کردبوو کشایەوە و دەوڵەتێکی بێلایەنی لێدا مەزرێندرا، سەریاکی ئەوانی دی لەسایەی چەکمە و زرێپۆشی ئۆردووی سووردا، لەخەتەری ئیمپریالیزم قوتاربوون و حەساونەوە!

کۆتایی ١٩٤٣ شیرکەتە ئەمریکی و ئینگلیزییەکان داوای ئیمتیازی نەوتی خوارووی ئێران دەکەن، لە سێپتەمبەری ١٩٤٤ دا (کافتارادزە) ی جێگری

وەزیری دەرەوەی شوورەوی و وەفدێك دەچنە تاران، داخوازیی ئیمتیازی نەوتی باکووری ئێران دەکەن. حوکومەتی ساعید وەرامیاندەداتەوە: (بەرلە ڕۆشنبوونەوەی باری ئابووری جیهان و هێوربوونەوەی بارە سیاسییەکە و کۆتاییهاتنی جەنگ، دەوڵەتی ئێران هیچ ئیمتیازێك بە هیچ دەوڵەتێك نادات).

ئەمە دەقی هەمان ئەو پێشنیارە بوو کە دوکتۆر ڕادمەنشی نوێنەری تودە لەپارلەماندا، پێشئەوەی شوورەوی داوای ئیمتیازی نەوت بکات، لە وەرامی داواکارییەکەی ئینگلیز و ئەمریکادا پێشچاوی خستبوو.

چەند ڕۆژێك پاشتر، کافتارادزە لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیدا لەتاران، داواکارییەکەی شوورەوی دووبارە دەکاتەوە و بەدەنگێکی ڕەق و تووڕەوە کە بۆنی هەڕەشەی لێدێت، هێرش دەکاتە سەر حوکومەتی ساعد و بەتێکدەری پەیوەندییەکانی نێوان شوورەوی و ئێران تۆمەتباری دەکات.

سێ ڕۆژ پاشتر، حیزبی تودە بەچاودێریی و هاریکاریی سەربازانی لەشکری سوور، خۆپیشاندانێك لە تاراندا ڕێکدەخات، دروشمی خۆپیشاندەرەکان (ڕوخانی حوکومەتی ساعد) و (ئیمتیازدانی نەوت بە شوورەوی) دەبێت.

حوکومەتەکەی ساعد پاش مانگێك دەڕوخێت و سوهام سوڵتان بەیات دەبێتە سەرەکوەزیران. لەکۆبوونەوەیەکی پارلەماندا، دوکتۆر موصەدەق پێشنیاری ئەوە دەکات، یاسایەکی وا دانرێت کە هیچ سەرەکوەزیرانێك مافی ئەوەی نەکەوێت بێڕازیبوونی پارلەمان، ئیمتیازی نەوتی ئێران بە هیچ وولاتێك بدات. ئەو پێشنیارە دەبێتە یاسا و ئاوێکی پاك بەدەستی کافتارادزە دا دەکات. ئەوێك کە مانگو نیوێکە چاوەڕوانە حوکومەتەکەی ساعد بڕوخێت و یەکێکی

دی بێتەجێی و ئیمتیازی نەوتیان بداتێ، ئومێدبڕاو دەبێت و بەهەڕەشەوە ووەك ناڕەزایی دەربڕینێك دەستبەجێ تاران جێدەهێڵێت و دەگەڕێتەوە بۆ مۆسكۆ. (٢٦)

مەسەلەی ئازربایجان و كوردستان، لەو كێشەیەوە سەریهەڵدا، ڕەنگە گەر كافتارادزە بەمەرامی خۆی گەیشتبا و بەهەرجۆرێك با ئیمتیازی نەوتی چنگكەوتبا، مەسەلەیەك بەنێوی كۆماری ئازربایجان و كوردستانەوە نەهاتبا گۆڕێ. چونكە تا ئەو كاتەش بەردەوام كوردیان خاوەكردەوە و ڕێگەی وەبەرگرتنی هەڵوێستی لەو چەشنەیان نەدەدان. بەلاّم كە دڵنیابوون لەوەی ئیدی دەوڵەتی ئێران ملنادات، ئەوجا ستالین ئامبازی ئامرازی هەڕەشە و زۆربۆهێنان و چاوزیتكردنەوە بوو. هەتا ئەو دەمكاتە، تاكە ئامرازی دەستی، ئۆردووی سوور و حیزبی تودە بوو. كە دڵنیا بوولەوەی هەتاسەر ناتوانێت لە ئێراندا بمێنێتەوە و درەنگ یا زوو، دەبێت چۆڵیكات، تودەش بەتەنیا هیچی پێناكرێت، بۆیە ناچار بوو ئامرازی گوشاری توندتر و گرنگتر و زۆرتر بێنێتە گۆڕێ. ئەوجا سەرەتا فیرقەی دیمۆكراتی دامەزراند و كۆماری ئازربایجانی پێدروستكردن، پاشانیش ڕێگەی كوردی دا، ئاواتی چەندساڵەیان بهێننەدی و كۆمارۆچكەیەك دامەزرێنن. كۆمەكی زۆریشی بەهەردوولایان كرد.

هەتا ئێرە وەرامی نیوەی پرسیارە ساكارەكەی خۆمان چنگدەكەوێتەوە، ئەویش ئەوەیە كە ئەو هەموو ماوەیەی سالاّنی جەنگ، ڕێگە بە كورد و ئازەریی نەدرا هەنگاوێكی لەو بابەتە هەڵنێن، بەلاّم كە بەرژەوەندییەكانی وایپێویستكرد وەك ئامرازێكی زۆربۆهێنەر و گوشارخەرەسەر ڕایانكێشێتە جەرگەی

ڕووداوەکانـەوە وسـەودا و مامـەڵیان پێوەبکـات، ئـەوجا ڕێگـەی پێـدان و پشتگیریـشی لێکـردن. دیـارە لـە بازییـەکی لـەو بابەتـەدا تـا وەرەقـەی زێـتری بەدەستەوەبێت، جێپێی قایمتر دەبێت و دەتوانێت باشتر بیجەڕێنێت.

نیـوەی دووهـەمی وەرامـی پرسـیارەکەمان لـە کایـە و ڕۆڵ و پـلان و نەخشە و فرِوفێـڵ و دەهۆبـازیی قـەوام سـەڵتەنە دا دەدۆزینـەوە، کاتێـك زۆر ئەهریمەنانـە توانی فاقەکەی شوورەوی بە چیلکەیەك پووچ بتەقێنێتەوە.

قەوام سیاسەتبازێکی زۆرزان و بەتەجرەبە بوو، وەك لەهەنـدێك بەڵگەنامە و دوکـۆمێنتی دەسـتکەوتوو دا دەرکـەوتووە، گوایـە بـەردەوام باڵوێزخانـەکانی ئەمریکا و ئینگلتەرەی لە گشت هەنگاوێك ئاگادارکردووە و ڕاوێژی پێکردوون. دیـارە ئـەوانیش نەخشە و پلانـی پێویـستیان بۆکێـشاوە و لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو ڕاوێژکارییانـەدا هـەنگاوی هـەڵناوە، بۆیـە وا سـەرکەوتووانە تـوانی سـۆڤیەت بخاتـە مەوقعێکـەوە، کـە بـێ هـیچ دەسـتکەوتێك و بـێ زیانگەیانـدنێکی ئـەوتۆ، بەری بۆ بەرهەڵدابکات و بەناچاریی پاشەکشە بکات.

قـەوام بازییەکـەی خـۆی سـەرەتا بـە پـشتگیریکردن و کۆمـەك بـە تـودە دەستپێکرد، بەوە پشتیوانیی فراکسیۆنی تودەی لـە پارلەمانـدا مسۆگەرکرد، ئەوجا هەوڵی دا شوورەوی واتێبگەیەنێت کە دۆستێکیانە و هێندەی لـە دەستی بێـت هەوڵـدەدات ئیمتیـازی نـەوت بـۆ ئـەوان مـسۆگەربکـات. وەك پێـشان ڕوونمانکردەوە حیزبی تودە ئەو خۆشبینییەی لای شوورەویش دروستکرد.

قـەوام نـەهات لەگـەڵ کـورد و ئازەرییـدا گفتوگـۆ دەسـتپێبکات. هەرچـەندە بەتاکە تاکە ڕوویەکی واپیێشاندەدان، تا لێکیان بکات و لاوازیانکات، بەلاَم ئەو

چاك دەیزانی كردنەوەی گرێكە لەلایەكی دیكەیە، بۆیە یەكەوڕاست چووە كن ستالین و مۆلۆتۆف، لای ڕوونبوو گەرشوورەوی پێڕازیكرێت دەستیان لێبەرهەڵداكات، ئیدی چ خەتەرێك لە ئارادا نامێنێت و خۆیان دەتلیسێنەوە و بەلادا دێن.

ئەوەبوو پاش بوونە سەرەكوەزیران، دەمودەست بە فڕۆكەیەكی تایبەتی شوورەوی چووە مۆسكۆ. عەمیدی نوری، كە یەكێك بوو لەئەندامانی وەفدەكەی قەوام ئاوها دەگێڕێتەوە: (لەیەكەم دیداری وەفدەكە و مۆلۆتۆف دا، ئەم مەسەلانە هاتنەگۆڕێ:

١-مەسەلەی ئیمتیازی نەوت، كە مۆلۆتۆف پێیوابوو نیشانەی دۆستایەتی ڕاستەقینەی شوورەوی و ئێرانە.

٢-مەسەلەی ئازربایجان، كە پێیوابوو مەسەلەیەكی نێوخۆی ئێرانە و دەبێت ئازەری و دەوڵەتی ئێران خۆیان لەسەری پێكبێن.

٣-مەسەلەی كێشانەوەی سوپای سوور، كە ئاڵۆزیی و نیگەرانیی باری ئێران و نێودەوڵەتیی بە ڕێگری دەزانی و بەڵێنی دا تا ٢ ی مارت بەشێك لە هێزەكانیان لە ئێران بكێشنەوە. (٢٧)

ڕوون و ئاشكرا دیارە كە مەسەلەی نەوت بەلای سۆڤیەتەوە مەسەلە جەوهەرییەكەیە ئەوانی دیكە مەسەلەی لاوەكین و ئامرازی گوشار. ئەوەتا شتێك بە نێوی مەسەلەی كوردەوە هەر لەئارادا نییە.

قەوام پاش مناوەرە و ئەمسەر و ئەوسەرێكی زۆر و هاتن و چوونی چەند وەفد و نوێنەرێك، پاشئەوەی شوورەوی لە داخوازیی ئیمتیازی نەوت دێتەخوارەوە و

داوای دامەزراندنی شیرکەتێکی نەوتی هاوبەش پێشچاودەخات، کە ٥١٪ ی بۆ شووروەوی بێت و ٤٩٪ ی بۆ ئێران. قەوام تێدەگات ئیدی ئەوە لایەنی کەمی داخوازیی شووروەوییە، بۆیە لەگەڵ سادتشیکۆفی باڵوێزی شووروەویدا ئەو پەیمانە مۆردەکات و لەسەر ئەوە رێکدەکەون کە بۆبڕیاردان بیخاتە بەردەمی پارلەمان. بەلاّم وا دەورەی چواردەهەم بەسەردەچێت و دەبێت ئامادەکاریی بۆ هەڵبژاردنەکانی دەورەی پازدەهەم بکرێت. ئەوەش بێ هەڵبژاردنێکی ئازادانە نایەتەدی. بۆیە پێویستە ئۆردووی سوور هێزەکانی بکێشێتەوە و رێگەی ئەو هەڵبژاردنە ئازادە فەراهەم بکات. شووروەوی تەنها بەوەوە نەوەستا هێزی خۆی بکێشێتەوە پشتی هەردوو کۆمارەکە بەرهەڵدا کات، بەڵکە لەوە دەترسا، بەریەرچدانەوەیەکی دژە رژێمی ئێران نیشانبدەن و سەودا و مامەڵەکە لەو تێکدەن، بۆیە بەردەوام ئامۆژگاریی دەکردن کە نەکەن هیچ زەبر و زەنگێک بەرامبەر حوکومەتی ئێران بنوێنن و ئەوان لەگەڵ رژێمی ئێراندا ئەوەیان براندۆتەوە کە مەسەلەکە بە هێمنی و ئاشتییانە چارەسەر بکەن. نەک هەر ئەوە، بەڵکە هەموو ئەو چەک و تەقەمەنییانەی بەکۆماری ئازربایجانیشیان دابوو، لەکاتی پاشەکشەیاندا لێیانسەندنەوە. ئەوەتا تەفرەشیان لەو بارەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

(رووسەکان ٥٦ تۆپی ٧٥ مللیمی دژە زرێپۆش و ١٢ تۆپی ١٠٥ مللیمیی و هەندەک گوللە تۆپ و رەشاشیان پێدابووین، کاتێک کشانەوە، گشت لەگشتی ئەو چەک و تفاقانەیان لێسەندینەوە و لەگەڵ خۆیان بردیاننەوە. تەنها ئەو چوار

تۆیە ٧٥ ملليمەیان بۆ جێهێشتین، کە خۆمان کاتی خۆی لە لەشکری ئێرانمان گرتبوو). (٢٨)

ئابەو جۆرە شوورەوی هەردوو کۆمارە دەستکردەکەی خۆی بێ پشت و پەنا و بەدەستی بەتاڵ بەرهەڵدا کرد و چارەنووسیانی دایەوە دەست ویژدانی ڕەگەزپەرستانی فارس. بەداخەوە خۆشی دڵۆپێك لەو نەوتەی پێنەبڕا، چونکە پارلەمانی ئێران بە پەیماننامەکە ڕازیی نەبوو.

ئائەمە هۆی ڕاستەقینەی ئەو مەسەلەیەیە کە کاك فازڵ پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە و دەنووسێت: "لە لێکۆڵینەوەی کوردەوانییدا لە شوورەوی، زۆر بەدەگمەن خۆ لەقەرەی ڕووداوەکانی دامەزران و ڕووخانی کۆماری مەهاباد دەدەن. گەر ناچاریشبن ، ئەوا زۆر خێرا و کورت و سەرپێیی". هەقیانە دەلاقەی وا گەورە بەهیچ لێفەیەك ناگیرێت.

بارزانی چەند ڕاستگۆیانە لەوبارەوە لە ١١ دێسەمبەری ١٩٤٦ دا لە بۆکان هاتبووە گۆ و گوتبووی: (ئەوەی لەبەردەم ئۆردووی ئێراندا شکا، کورد نەبوو، بەڵکە شوورەوی بوو لەبەرامبەر ئەمریکا و ئینگلیزدا شکستیهێنا). (٢٩)

بەداخەوە کاك فازڵ لەم بەندەدا کەوتۆتە چەند هەڵەیەکەوە، کە ڕاستکردنەوەیان بە پێویست دەزانم. بۆیە وا لەبەرەوە یەکەیەکە دەستنیشانیان دەکەم:

لە ل٨٥ دا دەنووسێت: "ڕژێمی ئێران پارتی کۆمۆنیستی یاساغکرد و لە ژونی ١٩٣١ دا پاکسازیی کۆمۆنیستانی دەستدایە. ئەمە کۆتایی چالاکی پارتی

کۆمۆنیست بوو. ئیدی ئەوکاتە پارتێکی نوێ دامەزرایەوە کە لەشکری سوور لە ١٩٤١ دا چووە ئێرانەوە".

ئەم زانیارییەی کاك فازڵ هەڵەیە. پارتی کۆمۆنیست لە ١٩٤١ دا دانەمەزرایەوە، بەڵکە لە ١٩٣٥ دا لەلایەن دوکتۆر (تەقی ئەرانی) یەوە دامەزرێندرایەوە. دوکتۆر ئەرانی لەو ساڵەدا بە بیانووی گەشتێکی ئینگلتەراوە، بە مۆسکۆدا تێدەپەڕێت و لەوێ پەیوەندیی بە بڕێك لەبەشدارانی حەوتهەمین کۆنگرەی ئومەمیی شیوعییەوە دەکات. پاشان کۆمینتێرن نەسروڵڵا کامران (ئەسلانی) بەدزییەوە دەنێرێتەوە ئێران، تا پەیوەندیی بە دوکتۆر ئەرانییەوە بکات و پارتی کۆمۆنیست دامەزرێننەوە. کامران بەدزییەوە دەچێتەوە تاران و پەیوەندیی بە ئەرانی و دۆستە دێرینەکانییەوە دەکات و پاش کۆشش و تەقەلایەکی زۆر، بڕیاردەدەن پارتی کۆمۆنیستی ئێران دابمەزرێننەوە. کۆمیتەیەکی کاتی سێقۆڵی پێکدەهێنن و تا کۆنگرەی سێهەم ئەرکی بەڕێوەبردنی حیزبەکە لەئەستۆ دەگرن. کۆمیتەکە بریتیی دەبێت لە:

١-دوکتۆر تەقی ئەرانی سکرتێری گشتیی

٢-عەبدولصەمەد کامبەخش بەرپرسی ڕێکخستن

٣-دوکتۆر محەمەد بەهرامی بەرپرسی دارایی

پاشان ئەو حیزبە وردە وردە تەشەنەدەکات و ژمارەیەکی زۆر خوێندکار و ڕۆشنبیر کۆدەکەنەوە. بەلام لە ١٩٣٧ دا ئاشکرادەبن و پۆلیس ٥٣ نەفەریان دەگرێت. ئەو ڕووداوە لە مێژووی کۆمۆنیستانی ئێراندا بە (پەنجا و سێ نەفەر) ناسراوە. هەر پەنجا و سێ نەفەرەکە دەدرێنە دادگا و لە زیندانیان توندەکەن.

دوکتۆرئەرانی پاش چەند ساڵێك لە زینداندا کۆچی دوایی دەکات. ئەوانی دی پاش هەڵهاتنی ڕەزاخان، لەبەرەوە ئازاد دەکرێن. (٣٠)

لە لاپەڕە ١٨٧ دا دەنووسێت: "هەروەها لە عێراقیش، کە ناوچەیەکی قۆرخکراوی ژێر دەستەلاتی ئینگلیز بوو، مایسی ١٩٤١، ئەفسەرە عارەبە ناسیۆنالیستە سەربە ئاڵەمانەکان، کودەتایەکی دژە بەریتانیایان ڕێبەرایەتی کرد".

چاکتروابوو کاکە فازڵ هێمای بەوە کردبا، کە مەبەست لەو کودەتایە ڕاپەڕینەکەی ڕەشید عالی گەیلانییە، تا بۆ خوێنەری نەشارەزا بە ڕووداوەکان، تەواو ڕوون بێت مەبەست کامە کودەتایە. پێشتریش هەمان سەرنجم سەبارەت بە کودەتاکەی شەواف هەبوو.

نووسەر لە لاپەڕە ١٩٦ دا دەنووسێت: "لە مارتی ١٩٤٥ دا لە مەهاباد پێشهاتێکی کولتووریی زۆر گرنگ ڕوویدا، یەکەم ئۆپەرای کوردی بەنێوی (دایکی نیشتمان) ەوە پێشکەش کرا".

ڕاستە پێشهاتێکی کولتوریی زۆرگرنگ و پڕبایەخ بوو، بەڵام ئۆپەرا نەبوو، بەڵکە شانۆگەرییەکی سادە و ئاسایی بوو. جوداوازیی نێوان ئۆپەرا و شانۆگەری ئاشکرایە. لە ئۆپەرادا ڕووداوەکان بە ئاوازی گۆرانییەوە و بەدەنگێکی تایبەتەوە دەگێڕدرێنەوە و مۆسیقاش لەگەڵیدا هاوئاهەنگە. لە شانۆگەریدا ڕووداوەکان بە گوتەی ئاسایی دەگێڕدرێنەوە و گەر مۆسیقاشی لەگەڵدابێت هاوئاهەنگ نییە و تەنها مۆسیقای تەصویرییە.

له لاپەڕە ٢٠١ دا دەنووسێت: "کۆمۆنیستەکانی ئازربایجان لە کۆماری گیلان دا چالاك بوون. یەکێك لە دامەزرێنەرانی پارتی کۆمۆنیستی ئێران ، جەعفەر پێشەوەری بوو، خەڵکی ئازربایجان و لەکۆماری گیلاندا وەزیری دەرەوە بوو. دوای ڕووخانی کۆماری گیلان، لەگەڵ هەزاران ئازربایجانییدا بۆ سۆڤیەت هەڵهات. پاش هاتنی سوپای سوور، پێشەوەری لەگەڵ پەنابەرێکی زۆردا بۆ ئێران گەڕایەوە " .

ئەم زانیارییەی کاك فازڵ ڕاست نییە. بەپێی برێك سەرچاوەی دژەکۆمۆنیستیی ئێران، گوایە پێشەوەری هەرئێرانییش نییە، بەڵکە خەڵکی ئازربایجانی سۆڤیەتە ولەسەردەمی کۆماری گیلان دا نێوی جەعفەرجەوادۆف بووە. پاش هەرەسی کۆماری گیلان، وەك کاك فازڵ نووسیویە، بۆ شووڕەوی هەڵدێت، بەلاّم پاش ماوەیەك بەدزییەوە دەگەڕێتەوە ئێران و دەست بە جموجۆڵ و چالاکیی سیاسی دەکاتەوە. بەلاّم لە ١٩٢٥ دا لەگەڵ چەند کۆمۆنیستێکی دیکەدا دەگیرێت و لەزیندانی قەسر توندەکرێت، تا هاتنی سوپای سوور و ڕاوەدوونانی ڕەزاخان، ئەو کاتە ئازاد دەکرێت، نەك گوایە پاش هاتنی ئۆردووی سوور گەڕابێتەوە بەدیوی ئێراندا، وەك کاك فازڵ بەهەڵە نووسیویە.

ئەوەتا دوکتۆر ئەنوەر خامەیی لە بیرەوەرییەکانی زیندانی قەسری دا ئاوها دەگێڕێتەوە: (کۆنەکان، بەو کۆمۆنیستانەمان دەگوت کە لەساڵی ١٣١٠ ەوە یاخود زووتر گیرابوون و لە زینداندابوون. هەموویان ئەندامان و سەرکردەکانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بوون، کە ساڵانی ١٣٠٩ و ١٣١٠ هەڵوەشابووەوە.

گرنگترین و دیارترینیان پێشەوەری و ئەرداشس ئەوانسیان بوون. پێشەوەری زۆرتر تەنها و کەنارگیر بوو، چونکە چ لایەنگرانی یوسف و چ لایەنگرانی ئەرداشس، ئەویان بە ئۆپۆرتونیست و سازشکار تاوانبار دەکرد و هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵیدا نەبوو و وێڵیان کردبوو). (٣١)

دوکتۆر خامەیی لەگەڵ شوێنی بیرەوەرییەکانی زیندانیدا، دەربارەی پێشەوەری و بەسەرهات و ڕووداوەکان، یادەوەریی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە.

کاك فازڵ لە لاپەڕە ٢٠٩ دا دەنووسێت: "بە پێچەوانەی ئازربایجانەوە، لە کۆماری کوردستاندا هیچ باسێك دەربارەی سۆسیالیزم و چارەسەرسازیی زەوی و خۆماڵیکردن لە ئارادا نەبوو. سەرجەم پڕوپاگەندە و سیاسەتی کۆمارەکە ناسیۆنالیستانە بوو".

لێرەدا بە پێویستی دەزانم چەند خاڵێك ڕوونکەمەوە:

١-دەبێت باری دواکەوتوویی کوردستان لەو ڕووەوە تێبخوێنینەوە. وەك نووسەر خۆی لە شوێنێکی دیدا پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە، کوردستانی ئێران دواکەوتووترین پارچەی کوردستان و یەکێك لە پاشکەوتووترین ناوچەکانی ئێران بوو، ئەویش بەهۆی ئەو پشتگوێخستن و فەرامۆشییە ئەنقەستەی ڕژێمەوە. بۆیە ئەو پارچەیەی کوردستان، تا ئەودەمە وەکو کۆمەڵایەتییەکی فیۆدالیزمی دوور لە پیشەسازیی و پێشکەوتن، مابووەوە. دیارە لە حاڵوبارێکی ئاوها دا، مەسەلەی سۆسیالیزم و چارەسەرسازیی زەوی، مەسەلەیەکی خەیاڵی دەبێت. تایبەت کە زۆربەی هەرە زۆری دەرەبەگ و ئاغاکان، هەر لەسەرەتاوە پشتگیریی کۆمارەکەیان کرد و گەلەکیان ڕێشمەی سەرکردایەتی بزووتنەوەکەشیان کەوتە

دەست. جگەلەوە ماوەی یازدە مانگتەمەن، بۆ حوکومەتێکی تازەدامەزراو، هێند کورت و کەمە کە فریاری شەقاونانی وا گەورە نەکەوێت.

٢-ڕاستە لە ئازربایجان بەهۆی بوونی پارتێکی کۆمۆنیستی وابەستە بە شووروەوییەوە، زۆر دەم لەمەسەلەی سۆسیالیزم و چارەسەرسازیی زەوی و خۆماڵیکردنی سینعەتەکان دەژەنرا، بەڵام هیچ هەنگاوێکی عەمەلی بۆ هەڵنەنرا. دیارە لەوێش وەکو کوردستان، ماوەی دەستەلاّدارێتی فیرقە کەم بوو. تەنها کارێك و چارەسەرسازییەك کە کرابێت، دابەشکردنی زەوی و موڵکی ئەو فیۆدالانە بوو، کە ئازربایجانیان جێهێشت و بۆ شوێنەکانی دیکەی ئێران هەڵهاتن ولەمپەڕی دوژمنایەتییان لە کۆمارەکە گرت، کە پێموایە ڕووداوی لەو بابەتە لەکوردستان یا نەبووە یاخود زۆرکەم بووە. لە ئازربایجانیش زەوی و موڵك و بەرژەوەندیی هیچ یەکێك لەو دەرەبەگ و سەرمایەدارانەی کەپشتگیریی کۆمارەکەیان دەکرد، نەکەوتە خەتەرەوە. هەتا زۆر لەو بۆرژوا و سەرمایەدارانەی خەریکی ئاڵوێل بوون و پەیوەندییەکی چاکیان لەگەڵ شووروەویدا سازدا و ئاڵوگۆڕی بازرگانییان دەکرد، حاڵ و داهاتیان، لەسەردەمی پێش کۆمارەکەش چاکتربوو. (٣٢)

٣-وەنەبێت بیری ناسیۆنالیزم لە ئازربایجان ووزەی لێبڕابێت و خەفە بووبێت، بەپێچەوانەوە، ئەوانەی حاڵوبارەکەی ئەوێیان دیتووە و بیرەوەرییەکانیان بۆتۆمارکردووین، دەگێڕنەوە کە بیری ناسیۆنالیزم لە ئازربایجان لەوپەڕی توندی و دەمارگیرییدا بووە. تایبەت لەکن ئەو هەڵهاتووانەی کە ماوەیەکی زۆرپەنایان بۆ شووروەوی بردبوو و لەسەروەختی

جەنگدا بۆ ئێران گەڕابوونەوە و بووبوونە کاربەدەستی ڕاستەقینەی فیرقە، خەونی هەمیشەییان داپچڕان بوو لە ئێران و پەیوەستیی بوو بە ئازربایجانی شوورەوییەوە، تا ئازربایجانێکی یەکگرتوو بێتە ئاراوە. ئەم بیرە لەلایەن گەلەك لەکاربەدەستانی سوپای سووری هاوڕەگەزیانەوە دنەدەدرا و پشتگیریی لێدەکرا. هەتا باقرۆف خۆی گوتبووی: (ئیدی سنووری نێوان هەردوو ئازربایجان لەڕووی کولتوری و ڕەسمییەوە لە نێواندا نەما و ڕۆژێك دێت کە تەنها یەك ئازربایجانی یەکگرتوو دەبێت). (٣٣)

٤-مادامێکی بەراورد هاتەپێش، بریا و خۆزیا کاکە فازڵ پەنجەی بۆ مەسەلەیەکی گرنگ و پڕبایەخیش ڕاکێشابا، ئەویش حاڵوباری خەڵکەکەیە لەژێر سایەی ئەو دوو ڕژێمەدا.

ئەوانەی هەردوو کۆمارەکەیان دیتووە، یاخود یەکێکیانیان دیتووە، گەواهی ئەوە دەدەن کە لە کۆماری کوردستاندا، ڕژێمێکی میللی تەواو دێمۆکراسییانە حوکمفەرما بووە. ئازادییەکی تەواوی ڕادەربڕین و هاتوچۆ و سەربەستییەکی بێوێنە بەرقەرار بووە. نە پۆلیسی نهێنی و نەهیچ دەزگەیەکی چاوزیتکردنەوە و سەرکوتکەرانە لە ئارادا نەبووە. لەماوەی ئەو یازدە مانگەدا تەنها نەفەرێك لە کۆماری کوردستاندا کوژراوە، ئەویش لەسەر خوێن و دوژمنایەتی کۆن. (٣٤) بەپێچەوانەی کۆماری ئازربایجانەوە کە بە سەدان کەس ئیعدام کراون و گەلەك لە کاربەدەستانی فیرقە بوونەتە ئامرازێکی داپڵۆسێن و خەڵك تۆقێن. با سەرێك بە بیرەوەرییەکانی ئەو کۆمۆنیستانەدا شۆڕکەینەوە کە بەسەرهاتەکانمان بۆ دەگێڕنەوە، وەکو (خلیل ملکی: خاصیراتی سیاسی)، (تفرشیان: قیام افسران

خوراسان)، ( انور خامەای: فُرصتی بزرگ از دست رفته)، ئەوجا دەزانین چ تاوانێك لە ئازربایجان کراوە. لێرەدا تەنها دوو نموونە پێشچاو دەخەم:

خامەیی لە زمانی دوکتۆر عینایەتوڵلاّ ڕەزاوە، کە یەکێك بووە لە ئەفسەرە دانا و کارامەکانی فیرقە، دەگێڕێتەوە: (ڕۆژێك بە یەکێك لە گۆڕەپانەکانی تەورێزدا تێدەپەڕیم، دیتم سێدارەیەك چەقێنراوە و خەڵکێکی زۆر کۆبوونەتەوە. چوومە پێشەوە تا بزانم چ ڕوویداوە، دیتم ژەنەراڵ عەلی کاویانی وەزیری جەنگ زۆر تووڕە و ئالۆزلەبەردەم سێدارەکەدا وەستاوە. لەپڕ فیدائییەك هات و دڕی بەخەڵکەکەدا و خۆی گەیاندە کن ژەنەراڵ. ژەنەراڵ خێرا پرسی: ها چبوو؟ فیدائی گوتی: قوربان دەڵێن هێشتا داوەریکردنی تەواو نەبووە! ژەنەراڵ زۆر بە تووڕەییەوە گوتی: دەوید باب، داوەریی چی؟ نابینی خەڵکیی چاوەڕێی مەراسیمی ئیعدامین، ڕاکە ڕایکێشە بیهێنە).

تەفرەشیان خۆی یەکێك بووە لە ئەفسەرە توودەییەکان، دەگێڕێتەوە:

(لە یادمە جارێك پێشەوەری هاتە سەردانی سەربازگەکەمان. لەکاتی هاتنیدا، ئەفسەری ئێشکچی لە چێشتخانە سەرپەرشتیی دابەشکردنی ژەمە خواردنی سەربازەکانی دەکرد. پێشەوەری لێیپرسی: بۆچ ژووری خۆتت جێهێشتووە؟ ئەفسەری ئێشکچی وەرامیداوە: قوربان خۆ نابێت من هەمیشە لەپشتی مێزەکەمەوە دانیشم، ئەرکی ڕاستەقینەی من ئەوەیە سەرپەرشتی هەموو کارێك بکەم، هەتا دابەشکردنی خواردنیش. پێشەوەری لەوەرامەکەی زۆر تووڕە بوو، فەرمانی بە سەربازەکان دا، لەئەفسەرەکەیان هەڵدەن. سەربازەکان

ئامـاده نـەبوون كـاری وا بكـەن. ئـەوجا پێشەوەری فـەرمانی بـە یـاوەرو یاساوڵەكانی خۆی دا، لە ئەفسەرەكەبدەن، ئەوانیش چاك چاك كوتایان.

ئەفسەرانی سـەربازگەكە، وەك نارەزاییەك لەو رەفتارەی پێشەوەری، چەند ساتێك مانیانگرت، بەلاّم دواترلەترسدا پەشیمان بوونەوە). (٣٥)

لـەو بیرەوەرییانەدا رووداو و بەسەرهاتی گەلەك لەوانە سەیرترو دلّتەزێنتر دەخوێنییەوە، كە لە كۆماری كوردستاندا روونەداو و نەدیتراو و نەناسراون.

كاك فازلّ لە ل١٩٨ دا دەنووسێت: "پێشنیازێكی دیكەی شوورەوی ئەوەبوو كە نێوی رێكخراوەكەیان لە كۆمەلّەی ژیاندنەوەی كوردەوە بۆ پارتی دێموكراتی كـورد بگـۆڕن، چـونكە حیزبـی تـودە رێكخـراوی ئازربایجـانی خـۆی هەلّوەشاندبووەوە و لەبریتی وی پارتی دێموكراتی ئازربایجانی دروستكردبوو".

لێرەدا بە پێویستی دەزانم دوو خالّ روونبكەمەوە:

١-هەرچەندە فیرقەی دێموكرات لەسەر داروپەردووی تودە دامەزرا وخۆی رێكخست، بەلاّم هەر بە فیرقەی دێموكرات ناسراوە، نەك حیزبی دێموكراتی ئازربایجان، وەك كاك فازلّ لە زۆر شوێندا بەهەلّە نووسیویە.

٢-ئەو بانگاشەیەی لە هەندەك ئەدەبیاتی تودە دا دەیخوێنینەوە، كە گوایە خۆیان لقی ئازربایجانیان هەلّوەشاندۆتەوە و فیرقەی دێموكراتیان لە جێگە دامەزراندووە، زۆر لە راستییەوە دوورە. تا باشتر ئەو كودەتایە روونبێتەوە كە لە تودە كرا، با بڕوانینە بیرەوەرییەكانی یەكێك لە تودەییە ئاگادارەكانی ئەو دەمە:

"هێشتا راپەڕینی ئەفسەرانی خۆراسان بەتەواوی خامۆش نەكرابوو، لە رۆژی ١٢ ی شەهریوەر دا، فیرقەی دێموكراتی ئازەربایجان ، بانگی دامەزراندنی خۆی

هەڵدا. نەخشەی دامەزراندنی ئەوفیرقەیە، زۆرزووتر لەلایەن کاربەدەستانی شوورەوییەوە کێشرابوو. چاکترین کەسانێك کە بۆ ئەرکە پەیدایان کردن، پێشەوەری و میرزا عەلی شەبوستەری و سەلامولّلاّ جاوید بوون. پێشەوەری لە نیوەی یەکەمی مانگی مورداد دا، بەڕێوەبەرایەتی ڕۆژنامەی (ئاژیر) ی بە دۆستانی وەکو کەریم کشاوەرزو فەرەیدون ئیبراهیمی سپارد و خۆی بۆ دامەزراندنی فیرقە چووە تەورێز. ئەو کاتە بەرپرسی لقی حیزب لە تەورێز، عەلی ئەمیر خیزی بوو، ئارداشس ئاوانسیانیش لەلایەن کۆمیتەی نێوەندییەوە بۆ سەرپەرشتیی لقەکە دانرابوو. بەهۆی ئەو گیر و گرفتە زۆرانەی لەولقەدا هەبوو و بە پلەی یەکەم پەنابەرانی گەڕاوەی شوورەوی لێیبەرپرس بوون، چونکە بایەخییان بە حیزب نەدەدا و یەکە و ڕاست بە دەزگەکانی سویای سوورەوە پەیوەست بوون. لەکۆتایی ١٣٢٣ دا کۆمیتەی نێوەندیی ، خەلیل مەلەکی بەدەستەلاّتی تەواوەوە ناردە تەورێز، تا باری لاری حیزب ڕاستکاتەوە. مەلەکی دەچێتە ئەوێ و دەست بە پاکسازیی حیزب دەکات. پەنابەرانی ئازربایجان و دژەکانی، لای دەستەلاّتدارانی شوورەوی بۆیتێدەچێنن. ئەوانیش دەستبەجێ لەڕێی باقرۆفەوە بالّوێزخانەی خۆیان ئاگاداردەکەنەوە و مەلەکی لە ئازربایجان دووردەخەنەوە.

ماکسیمۆفی بالّوێزی شوورەوی، بۆیەکەمینجار لەگەڵ گشت ئەندامانی کۆمیتەی نێوەندیی کۆبووەوە، فەرمانی دوورخستنەوەی مەلەکی پێدان. پێشەوەری، ئارداشس و عەلی ئەمیرخیزییش دووردەخاتەوە و صادق پادگان کە لە دۆستە نێزیکەکانی خۆی بوو، دەکاتە بەرپرسی لق. نەخشەی دامەزراندنی

فیرقەی دێمۆکرات، لەلایەن باقرۆفەوە کێشرابوو. ئەوقلیۆفی کونسوڵی شوورەوی لە تەورێز ئاگادار دەکات و بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە، ئاتاکیشیۆفی یاریدەدەری خۆی دەنێرێتە تەورێز. هەڵبژاردنی پێشەوەری بۆ ئەو کارە، بە ڕاوێژکاریی ئەوسێیە و ڕەزامەندیی باڵوێزخانەی شوورەوی بوو لەتاران.

بەلاّم پێشەوەری و هاوکارانی، ئەو مەسەلەیەیان لەسەرکردەکانی حیزب دەشاردەوە. لەڕاستییدا ئەوە پیلانێك بوو لە حیزبی تودە کرا. لەوەش دەردناکتر ئەوەیە کە ئەو پیلانە بەدەستی کاربەدەستانی شوورەوی نەخشەکێشکرا، کاربەدەستانێك، کەخۆیان حیزبی تودەیان دامەزراند.

ئەوەبوو صادق پادگان لە ١٢ ی شەهریوەر دا، خەنجەری لە پشتی حیزبی تودە دا و دەزگەی حیزبی تەسلیم بە پێشەوەری کرد، هەتا هیچ پرسێکی بە کۆمیتەی نێوەندییش نەکرد. ڕێبەرانی حیزب بەڕادەیەك لەو ڕەفتارە تووڕە و ناڕازیبوون، کە دەستبەجێ پلێنومێکی کۆمیتەی نێوەندی و کۆمیسیۆنی تەفتیش سازکرا و بەتێکڕای دەنگ ناڕەزایی بەرامبەر بەو هەڵوێستەی لقی ئازربایجان دەربڕرا. بەیاننامەیەك لەو بارەوە نوسرا، بەلاّم چونکە ئەو دەمە ڕۆژنامەکانی حیزب داخرابوون و یاساغ بوون، بۆیە بۆ چاپخانە نێردرا، تا چاپ و بلاّوکرێتەوە.

کامبەخش، بە تەجرەبە دەیزانی کە صادق پادگان خۆبەخۆ ئەوکارە ناکات و دیارە بە فەرمانی دەستەلاّتدارانی شوورەوی بووە، بۆیە بێ ئاگاداریی کۆمیتەی نێوەندیی دەچێتە چاپخانە و داوایان لێدەکات کە جارێ چاپی ڕاگرن. ئەوسا دەچێتە باڵوێزخانەی شوورەوی و هەموو مەسەلەکەیان بۆ

دەگێڕێتەوە. ئەوانیش بە پەیوەندیکاری حیزب ڕادەگەیەنن کە ئەو بەیاننامەیە هەڵەیە و نەکەن شتی وا بلاوکەنەوە. بۆیە کۆمیتەی نێوەندیی لە ئاستی ئەو ڕووداوە دا بێدەنگ و بێهەڵوێست مایەوە".

جا پاشان حیزبی تودە ناچارە بڵێت کە خۆیان بەو کارە هەڵستاون. دەنا دەبێت دان بەوەدا بنێن کە باڵوێزخانەی شوورەوی لە سەروو حیزبەوە بووە و هەرچی خواستبێت یا ڕاستەوخۆ بە حیزبیان کردووە، یا بێپرس و ئاگاداریی ئەوان کردوویانە.

"سەرەڕای ئەوەی زنجیرەیەك ڕاپەڕین و شۆڕشی نیشتمانیی لەم پارچەیەدا هەمیشە لەکلپە و بلێسەدا بووە و کورد لێرە دژی هێزی چاوچنۆکی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و عێراقی وابەستەی جەنگاوە، کەچی لەنێوان هەردوو جەنگە جیهانییەکەدا، سۆڤیەت هیچ ڕوویەکی پێشانی مەسەلەی کورد لەم پارچەیەدا نەداوە. بەلاّم لەپاش دووهەم جەنگەوە سۆڤیەت خەریکی ڕایەڵکردنی داوی پەیوەندیی بووە لەگەڵ بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد لە عێراقدا. پەیوەندیی سۆڤیەت لەگەڵ تاکە تاکەی ئەو بزووتنەوەیەدا و لەگەڵ پارتە کۆمۆنیستەکانی ناوچەکەدا، چاکترین داردەست بوو بۆ گوشارخستنە سەر ئەو ڕژێمانە. سۆڤیەت هیچکات پشتگیریی بزووتنەوەی نیشتمانیی کوردی عێراقی بۆ جوودابوونەوە لە عێراق نەکردووە، بەڵکە تەنها بۆ بەدەستهێنانی مافی ئۆتۆنۆمی لە چێوەی عێراقدا. ئا ئەو جۆرە پەیوەندییە بە چاکترین شێوە خزمەتی پلانە ستراتیژییەکانی سۆڤیەتی کردووە.

لە پاش دووهەم جەنگی جیهانییەوە، بارودۆخی سیاسەتی جیهانیی هەلودەرفەتێکی دیکەی وەك بازییەکەی مەهابادی بۆ سۆڤیەت نە ڕەخساندەوە. بۆیە بەردەوام هەوڵیداوە جێپێیەك لای حوکومەتە نێوەندییەکان بۆخۆی بکاتەوە. لە عێراق دەرفەتی ئەو جۆرە پەیوەندییە ، یانی نارەسمیی و نیوە ڕەسمییە لەگەڵ هێزە بەرهەڵستکارەکاندا ڕەخسا، کە پاشان ڕێگەی ئەوەیان بۆ سۆڤیەت خۆشکرد دەستی بە حوکومەتی نێوەندییدا بگات. سالاّنی نێوان ١٩٥٨-١٩٧٥ باشترین هەل و دەرفەت بوو بۆ بەگەڕخستنی ئەو پلانە ستراتیژییانە. لەو سەردەمانەدا ، زۆربەی کات، شوورەوی داوی پەیوەندییەکی

چاکی لەگەڵ ڕژێمە یەك لەدووی یەکەکانی عێراقدا گرێداوە. بەلاّم بەهۆی ئەو کودەتـا و هێزگـۆڕکێ بەردەوا مانـەوە، ئـەو پەیوەندییانـە گەلـەکجار، کـزی و کەنـەفتی و نـا دلّنیاییـان بـەخۆوە دیتـووە. بۆیـە شـوورەوی بـەردەوام پەیوەنـدیی نیوەڕەسمیی لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی عێرا ق و بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد دا هەبووە، تا بەپێی هەلّوێستی ڕژێمەکە، وەك هێزێکی پشتگیرییکەر، یاخود وەك هێزێکی زۆربۆهێنەر، بەرامبەر ڕژێمەکە هەلّیانسووڕێنێت.

بەو شێوەیە شوورەوی ڕۆلّێکی گرنگی لە بوژاندنەوەی بزووتنەوەی نیشتمانیی کـورد و دامەزرانـدنی پـارتی دێمـۆکراتی کوردسـتانی عێراقـدا بەسـەرکردایەتی بارزانی، دیتووە. لە پەنجاکاندا، بەو هۆیانەوە کە ڕژێمی عێرا ق هەلّوێستێکی دژە شوورەوی و سـەربەڕۆژئاوای وەبەرگرتبوو، لـە پـەیمانی بەغدای ئـەنتی سـۆڤیەتدا بەشداربوو، بارزانی لەشوورەوی پەنابەر بوو، سۆڤیەت ڕوویـەکی چاکی پێشانی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد دەدا. هەرچەندە زانیاریی دەربارەی چۆنیەتی ئەو پەیوەندییانە، شاردراوە و کەمزانراون.

لـەپاش ١٩٥٨ ، کاتێك عێرا ق پەیوەندیی دیپلۆماسییانەی لەگەڵ سۆڤیەتدا بەستەوە و بارزانی و هاوەلّەکانی گەڕانەوە، ئەو پەیوەندییە نیوەڕەسمییەی نێوان سۆڤیەت و پارتی دێمۆکرات هەربەردەوام بوو. جارجارە وەفدی کورد داوەتی سۆڤیەت دەکران، زەمالە و کورسی بەخوێندکارانی کورد دەدرا.

پاش ١٩٦٣ ، شوورەوی پشتگیریی تەواوی لە شۆڕشی کورد دەکرد، لانی کەم دووجارانیش کەوتە نێوان شۆڕشی کورد و ڕژێمی عێراقەوە".

پاشان نووسەر بەشێوازێکی پوخت و پاراو باسی دامەزراندنی پارتی دێمۆکرات، هەر لە حیزبی هیوا و ڕزگاریی و کۆمەڵەی ژێکافەوە، تا شۆڕشی بارزانی ١٩٤٣ دەکات. ئەوجا باسی تەنینەوەی ئەو بیر و بۆچوونانەی سەردەمی جەنگ دەکات، کە زۆر کورد پێیانوابوو تەنها بە کۆمەکی سۆڤیەت ئازادیی بەدەست دەهێندرێت. وەك بەڵگە پەنجە بۆ ئەو نامەیە ڕادەکێشێت کە کۆمەڵەی ژ.ك، لە ١٩٤٥ دا بۆ بارزانییان نووسیوە.

لە پەراوێزی ژمارە ٧ ی لاپەڕە ٢٣٧ دا، کە لە لاپەڕە ٢٦٦ دا، ئەو پەراوێزە ڕوونکراوەتەوە، دەنووسێت: "دەقی ئەم نامایە، بۆ یەکەمینجار لەم کارنامەیەدا بلاّودەکرێتەوە". پاشانیش لە ل ٢٨٢ دا دەقی نامەکە وەك پاشکۆیەك بلاّودەکاتەوە.

بەداخەوە دەبێت بڵێم ئەو بانگاشەیەی کاك فازڵ ڕاست نییە، چونکە شەش مانگبەر لە تەواوبوونی کارنامەکەی ئەو، لەلایەن خوشکە نەرمین ئەبوبەکرەوە بلاّوکراوەتەوە. (٣٧) مەگەر مەبەستی کاك فازڵ ئەوەبێت کە بۆ یەکەمجارە بە ئاڵەمانی بلاّودەکرێتەوە، هەرچەندە هیچ هێمایەکی لەو بابەتەی تێدا نییە. ئەز پێموانییە کاك فازڵ لە بلاّوبوونەوەی ئەو نامەیە بێئاگابێت. ئەگەر ئەو پێش خوشکە نەرمین ئەو نامەیەی گیرکەوتبێت، ئەوا دەیتوانی پێشئەوەی چاپی کارنامەکەی تەواو بێت، ئەو دێڕە "بۆ یەکەمینجارە لەم کارنامەیەدا بلاّودەکرێتەوە" لابەرێت و بیسڕێتەوە. چونکە چیدی یەکەمجار نەما و بەر لەکارنامەکەی ئەو بلاّوکراوەتەوە.

لەو گەشتە مێژووییەی کاك فازڵ بەڕووداوەکانی سەردەمی پارتی دێمۆکراتدا کردوویە، دەتوانین ئەم خاڵانە پوختەکەین:

١-بەهۆی باروودۆخی دووهەم جەنگی جیهانییەوە و بوونی سۆڤیەت لەبەشێکی کوردستانی خۆرهەڵاتدا، دامەزراندنی پارتی دێمۆکراتی کوردستانی عێراق لەسەر داوای کاربەدەستانی سۆڤیەت بووە و بەڕاوێژکاریی ئەوان کراوە. هەتا برێك لەسەرکردەکانیشی ئەوان بەسەر حیزبەکەیاندا سەپاندوون، وەك شێخ لەتیفی حەفید و کاکە زیادی کۆیە. سەرهەڵدان و دەرکەوتنی کەسێکی وەك هەمزە عەبدوڵڵا لەڕیزی پێشی پێشەوەی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد دا، لەسەر داخوازی پارتی کۆمۆنیستی سوریا و خالید بەگداش بووە.

٢-بەوهۆیەوە پرۆگرامی پارت لەسەرەتاوە تەواو چەپیی بووە و بەلای بەرەی ڕۆژهەڵاتدا دایشکاندووە. هەتا لە سێهەم کۆنگرەیدا کە ساڵی ١٩٥٣ سازکرا، خۆی بە پارتێکی مارکسیی لێنینی لە قەڵەم داوە.

٣-داخوازیی و ئامانجی پارتەکە لەسەر داوا و ڕاوێژی شوورەوی لە داوای ئۆتۆنۆمی تێنەپەڕاندووە.

لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندیی نێوان پارتی دێمۆکرات و پارتی کۆمۆنیست، بێ تێکگیربوون و دژایەتی نەبووە. هەرایان لەسەر ئەم خاڵانە بووە:

١-ئایا کورد نەتەوەیە یان نا؟ کۆمۆنیست کوردی بەنەتەوە نەزانیوە، چونکە بەپێی بۆچوون و تێزەکانی ستالین لەبارەی نەتەوەوە، لەبەر ئەوەی کورد

ئابوورییەکی هاوبەشی نییە، یانی یەکێك لەمەرجەکانی نەتەوەی تێدا نییە، کەواتە کەمەنەتەوەیە.

٢-کام لا مافی پێشڕەوایەتی جەماوەری لە کوردستاندا هەیە؟

٣-چارەسەری کێشەی کورد چییە ؟

لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا، دوو ڕووداوی ناوچەیی گرنگ، بزووتنەوەی نیشتمانیی کوردیان زێتر بەرەو نێزیکبوونەوە لە شوورەوی بەکێشکرد:

١-بەستنی پەیمانی بەغدای ١٩٥٥ ی نێوان عێراق و تورکیا و ئێران و پاکستان، کە لەلایەکەوە بۆ دژایەتی شوورەوی و لە لایەکی دییەوە دژی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد تەون کرابوو.

٢-لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم ناوچەیە پاوانی هێزە ڕۆژئاواییەکان بوو، شوورەوی توانی جێپێیەکی کەم لەهەندەك لەو وولاّتانەدا بۆخۆی بکاتەوە. ناردنی چەك بۆ میسر و سوریا و پشتگیریکردنی میسر لە جەنگی سوێسی ١٩٥٦ دا، یەکەم شەقاوی ئەو جێپێی خۆکردنەوەیە بوو".

لەتەك ئەو دوو هۆیەدا کە کاك فازڵ دەستنیشانی کردوون، کە دەتوانین بەهۆ دەرەکییەکانی ئەو نێزیکبوونەوەیەی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد و سۆڤیەت نێویان بەرین، چەند هۆیەکی گرنگی نێوخۆییش هەبوون ، کە دەکرێت لەم خالاّنەدا کۆیانکەینەوە:

١-ئەو دەمە پارتی دێمۆکراتی کوردستان حیزبی تاقانەی کورد بوو. سەرۆکەکەی کە نێوێکی گەلەك درەوشاوەی هەبوو، وەك پالّەوان و سەرکردەیەکی میللی ناسرابوو، لە سۆڤیەت پەنا درابوو. ئەمە خۆی لەخۆیدا،

هۆیـەکی گـرنگ بـوو بـۆ بەرزبوونـەوەی پایـەی خۆشەویـستی و ڕێـزی سـۆڤیەت لەدڵی ئەندامانی حیزبەکە وجەماوەرێکی زۆری میللەتەکە دا.

٢-سـەرکردایەتی ڕاسـتەقینەی حیزبەکـە، تایبـەت باڵی هـەمزە عەبـدوڵلاّ، لایـەنگرو دۆسـتێکی بـێ چـەند و چـوونی شـوورەوی بـوون. هەڵوێـست و هەڵـسەنگاندنەکانی سـەرکردایەتییەکە، لـەکن جـەماوەری حیزبەکـەش ڕەنگیدەدایەوە. نووسەرخۆی لە ل ٢٤١ دا پەنجەی بۆئەوە ڕاکێشاوە، کە هەمزە عەبدوڵلاّ داکراوی دەستی خالید بەگداش و پارتی کۆمۆنیستی سوریا بووە.

٣-کۆمۆنیـستەکان و سـەرکردە مارکسیـستە سـەربـە سۆڤیەتەکانی پـارتی، بـەردەوام مەسـەلەی دامەزرانـدنی کۆمـاری مـەهابادیان وەبـیر میللەتەکـە دەهێنـایـەوە، کـە چـۆن بـە کۆمـەکی سـۆڤیەت دامـەزرا. چـەندە قـەوارەی ئـەو کۆمـەك و ڕۆڵـەی سـۆڤیەتیان قەبـەدەکرد، هێنـدە لـە ئاسـتی خۆدزینـەوە و خۆکێشانەوە و هـۆی ڕاسـتەقینەی ڕووخـانی کۆمارەکـەدا خۆیـان گێـل دەکـرد و دەوری سـۆڤیەتیان کـەم و بێبایـەخ پێـشان دەدا و تاوانەکـەیان تـەنها و تـەنها بەسەری هێزە ئیمپریالیستەکاندا دەسوو.

پاشان نووسەر دێتەسەر باسی هەڵهاتنی بارزانی بۆ شوورەوی. پەنجە بۆ ئەو ڕاستییە ڕادەکێـشێت، کـە سـەرەتا حـاڵی بارزانییـە پەنابـەرەکان لەسـۆڤیەت خراپ بووە. دوو هۆ بۆ ئەو حاڵوبارە دەستنیشاندەکات:

١-هەڵوێستی شۆڤێنیستانەی جەعفەر باقرۆف بەرامبەر مەسەلەی کورد.

٢-بێنەخشەیی و خۆ نەگرتوویی سیاسەتی ستالین ئالەوسەردەمی پاش هەرەسەی کۆماری مەهاباد دا بەرامبەر مەسەلەی کورد. هەرچەندە ئەو هەڵوێستە بەهاتنی خرۆشۆف گۆڕدرا و کالآیەکی دیکەی پۆشی.

ئەوجا باسی حاڵی لەوپاشی بارزانییان دەکات. ڕێگەی پەیوەندییان بە کوردەکانی سۆڤیەتەوە بەری پێگیراوە. هەتا ڕێگەی ئەوەشیان نەدراوە ژن لە کوردەکانی سۆڤیەت بخوازن، بەلاّم هانی ئەوەیان داون ژن لەمیللەتانی دیکەی سۆڤیەت بهێنن.

پاشان دێتەسەرباسی سەردەمی کودەتای تەموزی ١٩٥٨ و پەیوەندیی سۆڤیەت لەگەڵ ڕژێمی نوێی عێراق و بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد دا و گەڕانەوەی بارزانییان بۆ عێراق.

عێراق دەستبەجێ پەیوەندیی دیپلۆماسیی لەگەڵ شوورەوی و وولاّتانی دیکەی بەرەی ڕۆژهەلاّتدا (جگەلە ئالّەمانیای خۆرهەلاّت) دەبەستێتەوە. چەندین پەیمانی ئابووری لەگەڵ سۆڤیەتدا مۆردەکات. کارناسانی ئابووری و سوپایی سۆڤیەت ڕوولە عێراق دەکەن. گەلەك خوێندکاری عێراقی بۆ خوێندن دەچنە شوورەوی و وولاّتانی سۆسیالیست. لە هەمووی گرنگتر کۆمەکی سوپایی بووبە عێراق، کە سیستێمی چەکداریی عێراقی لە ئینگلیزییەوە گۆڕی بۆ ڕووسی.

لەتەك ئەو پەیوەندییانەی سۆڤیەت و ڕژێمی عێراقدا، پەیوەندیی لەگەڵ پارتی کۆمۆنیست و بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد دا بەتینتر کرا.

پارتی کۆمۆنیستی عێراق بووە یەکە هێزی سیاسی. لەنێو ڕیزەکانی سوپا و دەزگە حوکومییەکاندا هێز و گوڕی پەیدا کرد. نێوبراو بە (مقاومەی شەعبیی)

دامەزراند. هەرچەندە پەیوەندیی پارتی دیموکرات و پارتی کۆمۆنیست چاك بوو، بەلام ململانێی نێوانیان هەرنەبڕایەوە. هەردووکلا پشتگیریی تەواویان لەڕژێم دەکرد، لە خامۆشکردنی کودەتاکەی شەواف و کارەساتەکەی کەرکوك دا، ڕاستەوخۆ بەجووتە شداربوون و پشتی ڕژێمیان گرت.

شوورەوی لە بواری پڕوپاگەندە و لەبلاوکراوەکانیدا پشتگیریی تەواوی لە مەسەلەی کورد دەکرد، بەلام تا ڕادەی ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عێراقدا. بارزانی و سەرانی پارت، بەردەوام داوەتی بالوێزخانەی شوورەوی دەکران و هامشۆ و سەردانی زۆریان دەکرد. پارتی دیموکرات لەڕووی ماددیشەوە باربووی زۆری پێدەکرا و بلاوکردنەوەی ڕۆژنامەی خەبات بەو کۆمەکەی شوورەوی هەلدەسووڕێندرا. کاتێك هەندە هۆزە کوردێکی دوژمنی بارزانی پەلاماری هۆزی بارزانیان دا، ڕۆژنامەکانی سۆڤیەت بەتوندی هێرشیان کردنە سەر و بە بەکرێگیراوی ئیمپریالیزم نێویان دەبردن.

سەرەڕای ئەو پەیوەندییە چاکەش، ۱۹۵۹ پێشهاتێکی ناگەهان پێوەندی نێوان پارتی کۆمۆنیست و پارتی دیموکراتی شلۆق کرد. ئەوەبوو بارزانی هەمزە عەبدوللا و هەڤالەکانی، کە بە بالی چەپی نێو پارت ناسرابوون، لەڕیزی حیزبەکەی تووردانەدەرەوە، بەو بیانووەی ئەوانە زێتر لە هەلپەی مسۆگەرکردنی بەرژەوەندییەکانی پارتی کۆمۆنیست دان، نەك کورد. سەرباری ئەوەش پەیوەندیی نێوان بارزانی و پارتەکەی لەگەل شوورەویدا هەر بەچاکی مایەوە.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم چۆنیەتی ئەو ڕووداوە و هۆی بەردەوامیی ئەو پەیوەندییە چاکەی بارزانی و پارتەکەی لەگەل سۆڤیەتدا پاش ئەو پێشهاتەش،

لە نووسینێکەوە بۆ خوێنەران ڕاگوێزم، کە بەداخەوە هیچ نێوێکی لەسەر نییە.
نووسەرەکەی لەژێر سەردێڕی (دەربارەی ڕابەریی پارتی دێمۆکراتی کوردستان بەر لە ١٩٦٣) دا دەڵێت:

"....... بەلاّم بارزانیی لە برایم ئەحمەد هەردردۆنگ بوو، پشتی هەمزە عەبدولّلای دەگرت، هەتا ئەو ڕۆژەی هەمزە عەبدولّلاّ هەڵەی کوشندەی عومری کرد و ویستی ڕێکخراوەکانی پارتی لە ڕێکخراوە شیوعییە عێراقییەکاندا حەل بکا و پارتی بکا بە تابعی حیزبی شیوعی عێراقی. دەستەی برایم ئەحمەد دژی ئەوە بوون و ڕاستەوخۆ لەڕێگەی ئەحمەد تۆفیق (عەبدولّلاّ ئیسحاقی) یەوە هەوڵیاندەدا بارزانی دەست لە دەستەی هەمزە عەبدولّلاّ بەربدا و ئەوان تەبەنّی بکا. ئەم هەڵەیان بەدەرفەت زانی بۆ پتر نێزیکبوونەوە لە هەستی کوردایەتی بارزانی. بارزانی لێیداواکردن کە گۆنگرەیەك بگرن و مەسەلەکە ببڕیننەوە. بەلاّم برایم و هەڤاڵەکانی زۆر بەڕوونی تێیانگەیاند کە کۆنگرە بەزیانیان دەبێت، چونکە زۆربەی حیزب لەگەڵ هەمزەدایە و هەرچۆنێك بێ دەبێ بارزانی نفوزی خۆی بەکار بێنێ. بارزانی لە شەوی ٣٠ حوزەیرانی ١٩٥٩ دا، وێڕای چەند چەکدارێك، چووە بارەگای حیزب لە شەقامی موتەنەبی- بەغدا و بە کۆمەڵێك جوێن و هەڕەشەوە دەستەی هەمزە عەبدولّلای دەرکرد و کلیلەکانی بارەگای هێنا و دایەدەست هەڤالاّنی برایم ئەحمەد و ووتی بڕۆن بەیانیان لەسەر دەرکەن!

بەوجۆرە هەمزە عەبدولّلاّ کە نفوزی عەشیرەتی بارزان دەوری بۆ دیتبوو کە ببێت بە یەکەم سکرتێری حیزب، هەر بەو نفوزەش دەرکرا و هەر بەو نفوزەش

دەستەی برایم ئەحمەد دەستیان بەسەر پارت دا گرت و حیزبیان لە خەتی هەمزە عەبدوڵلاً پاککردەوە. مەکتەبی سیاسی کەوتە ئەویەڕی پڕوپاگەندە بۆ بارزانی و بەناو و ناوبانگی ئەووەوە کۆمەلاّنی خەڵکی کوردەواریان لەحیزب نزیك کردەوە. بەمە ژمارەی ئەندامان لە ژمارەیەکی کەمەوە بە ژمارەیەکی زۆر گەیشت.

بەرپرسیارانی یەکێتی سۆڤیەت بەم گۆڕانە زۆر ناڕەحەت بوون، لەجیاتی ئەوەی هەمزە عەبدوڵلاّ بەشێوەیەکی تر ئاراستە بکەن و نەهێڵن وا بەسووك و هاسانی خۆی لە مەیدانی خەباتی کورد وەدەرخات و ڕێگە بۆ برایم ئەحمەد و هەڤالاّنی خۆشکات، دوکتۆر موراد ڕەزمئاوەریان (٣٨) لە مۆسکۆوە ناردە لای بارزانی کە پێیبڵێت سۆڤیەت ئەو گۆڕانە لە پارتیدا بە پیلانێکی ئینگلیز تێدەگات و دەبێ پێشی پێبگیرێ. بارزانی بە دوکتۆر مورادی ووت کە ئەو، یانی بارزانی، ناتوانێت ڕێگە بدا حیزبەکەی بکرێ بە لقێکی حیزبی شیوعی عێراق و تاقە بەدیلێك بە دەستەوەیەتی دەستەی برایم ئەحمەدە. بارزانی دوکتۆر موراديشی دڵنیاکردەوە کە هەمووشتێك هەربەدەستی خۆی دەبێ. بۆ سەلماندنی ئەو قسانەی، دوکتۆر مورادی لەگەڵ خۆی بردە کۆنگرەی دا هاتوو (١٩٦٠/٥/٨) کە هەمزە عەبدوڵلاّ و دەستەکەی بەڕەسمیی لە حیزب دەرکران و لەکۆنگرەدا بارزانی کۆمەڵێك جوێنی بەهەموو پارتییەکە دا تا هەمولایەك باش تێبگەن کەهەرخۆی شتە و کەس لە حیزبدا هیچ نییە.

تەنانەت دوکتۆر موراديشی کرد بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی و مەکتەبی سیاسی حیزب. هەرچەندە ڕووسەکان هەمیشە هەر سووربوون لەسەر ئەوەی

کە برایم ئەحمەد و کەسانێکی تری نزیکی ئەو پیاوی بەریتانیا بوون، بەلاّم بەهەرحالّ دوکتۆر موراد لە توانا و دەستەلاّتی بارزانی دلّنیابوو و بەراپۆرتی شادەوە گەڕایەوە مۆسکۆ".

"ئامانجی سیاسەتی سۆڤیەت لەو سەروەختەدا، بوونی پارتێکی بەهێز و توانای کوردبوو. تەنها بۆ ئەوە نەبوو کە لەو ڕێگەیەوە جێپێیەکی سیاسی لە عێراقدا بۆ خۆ بکەنەوە، بەلّکە بەو هیوایەش بوو کە ڕێڕەوی پەیوەندییەك لەگەلّ بزووتنەوەی کوردایەتی پارچەکانی دیکەی کوردستانیشدا بنیاتنێن.

لە ئۆکتۆبەری ١٩٦٠ دا بارزانی بۆ ٢١ هەمین کۆنگرەی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت داوەتکرا. ئەو سەردەمە تازە ئالّۆزیی و گرژی پەیوەندییەکانی کورد و ڕژێم لەلایەك و کۆمۆنیست و ڕژێم لەلایەکی دییەوە، سەریانهەلّدابوو. قاسم پشتی لەچەپ دەکرد و بەنیازی چەسپاندنی ملهوڕی و دیکتاتۆرێتی بوو. ئێدی کاتی ئەوە هاتبوو کە سۆڤیەت زۆری بۆ بهێنێت.

بارزانی لە مۆسکۆ بەگەرمی پێشوازی لێکرا وڕێزی زۆری لێگیرا. لەگەلّ سۆسلۆف و هەندەك لە سیاسەتمەدارانی دیکەی نێوداری سۆڤیەتدا چەند جارێك کۆبووەوە. بارزانی ڕاسپێردرا زۆر بۆ قاسم بهێنێت، ئەگەر پێویستیکرد تاڕادەیەك پەنا بۆ هێزیش بەرێت. ئامۆژگارییش کرا کە بەغدا جێبهێلّێت و بچێتەوە کوردستان. پارەیەکی زۆریشی بەنێوی خەرامانی ئەوچەکانەوە کەکاتی هەلّهاتنیان بۆ سۆڤیەتیان بردبوو، هەروەها بەنێوی مووچەی خانەنشینیی ئەو پەنابەرانەوە کە ئەو دوازدە سالّە لە شوورەوی کاریان کردبوو، پێدرا. گفتی کۆمەکی دیکەشیان دایە.

پاش گەڕانەوەی، لە مارتی ١٩٦١ دا ڕۆژنامەی خەبات داخرا و لە ئاوریلیشدا گشت بارەگاکانی پارت لە بەغدا و شارەکانی کوردستاندا مۆرکران".

بە پێویستی دەزانم لێرەدا سەرنجی خوێنەر بۆ چەند خاڵێکی گرنگ ڕابکێشم :

نووسەر لە سەرەتاوە نووسیبووی گوایە پارتی کۆمۆنیستی عێراق، هەر لەکاتی دامەزراندنییەوە پشتگیریی مافی چارەنووسی گەلی کوردی کردووە، بەلاّم لە ل ٢٤٥ دا دەنووسێت :"پارتی کۆمۆنیستی عێراق، بەپێی شیکردنەوەکانی ستالین، کوردی بە کەمەنەتەوەیەك دادەنا، نەك نەتەوە".

لە لاپەڕە ٢٤٦ دا دەنووسێت : "پارتی کۆمۆنیستی عێراق، لەگەڵ مافی ئۆتۆنۆمی کورد دا بوو لە چوارچێوەی عێراقدا، چونکە هەوڵی جودابوونەوە توانای خەباتی گەلانی عێراق لاوازدەکات".

لێرەدا چەند پرسیارێك خۆ دەسەپێنن:

١-داخۆ مافی چارەنووسی کەمەنەتەوەیەك و نەتەوەیەکی لەتلەتکراو وەك یەکن؟

٢-ئایا ئەوە هەڵسەنگاندن و تێڕوانینێکی زانستانەی ڕاست بووە لەمەسەلەکە؟

٣-داخۆ پارتی کۆمۆنیستی عێراق، لەهەموو سەردەمێکی گۆڕانە سیاسییەکانی عێراقدا، هەر بۆ ئەو هەڵسەنگاندنە سەقەت و نیوە و ناچلاّنەی خۆی بەئەمەك ماوەتەوە؟

٤-ئایا پارتی کۆمۆنیستی عێراق، ئێستا، پاش نیو سەدە لە دامەزراندنی و پاش دەیان شۆڕش و ڕاپەڕینی کورد، پاش ملوێنەها قوربانیی و دنیایەك ماڵوێرانی و دەریایەك خوێن و ئەسرین، ئەو مافی چارەنووسە بەکورد ڕەوا دەبینێت و بڕیار دەداتە دەست کورد خۆی؟

ئەمانە کۆمەڵێك پرسیارن و دەیان پرسیاری دیکەیان لێدەبێتەوە و خوێنەر دەتوانێت لەخۆیی بکات و وەرامی هەندێکیشیان زۆر ئاسان بداتەوە.

بەپێچەوانەی بۆچوونی کاك فازڵەوە، پارتی کۆمۆنیستی عێراق هەر لەسەرەتای دامەزراندنییەوە دانی بە مافی چارەنووسی کورد دا نەناوە، بەڵکە لەسەرەتاوە داوای مافێکی هاوسانیان بۆ کورد کردووە. لەخاڵی دەهەمی میساقی نیشتمانییدا، کە پاشان یەکەم کۆنگرەی پارتی کۆمۆنیست لە ١٩٤٥ دا بڕیاری لەسەردا، دەڵێت: (لەپێناوی بەدیهێنانی مافی چوونیەکییەکی ڕاستەقینەی کەمەنەتەوەیی کورددا خەبات دەکەین. لەگەڵ بەرچاوگرتنی مافی کەمەنەتەوەیی و ئاینییە گچکەکانی وەکو تورکمان و ئەرمەنی و یەزیدییەکاندا). (٣٩)

١٩٥٢، کاتێك بەهادین نوری دەبێتە سکرتێری گشتیی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، ئەو پرۆگرامە دەگۆڕێت و پرۆگرامێکی نوێ بۆ حیزبەکە دادەڕێژێت. لەو پرۆگرامە نوێیەدا، ڕەخنە لە پرۆگرامەکەی فەهد دەگرێت کە لە هیچ پەرەگرافێکیدا دان بە مافی چارەنووسی کورد دا نانێت و بەهەڵە یەزیدییەکانیش کە بەشێکن لە کورد، بە کەمەنەتەوەیی حسێبیاندەکات. (٤٠)

جا کەوشەن و سنووری فراوانی نێوان مافی کەمەنەتەوەییەك و نەتەوەیەك ئاشکرایە. ئەو تێڕوانینەی پارتی کۆمۆنیست لە مەسەلەی کورد، هیچکات ناتوانرێت بە تێڕوانینێکی زانستانەی مارکسی لێنینیستانە دابنرێت وەك خۆیان گەلەکجار خۆی پێهەڵدەدەنەوە.

لە بەندێکی دیکەی کارنامەکەدا کاك فازڵ گەشتێکی چڕوپڕ بە هەڵوێست و ڕەفتاری پارتی کۆمۆنیستی عێراقدا دەکات، کە پاشان بۆ خوێنەری ڕادەگوێزین و وەرامێکی گونجاو و لەباری ئەو پرسیارانەمان دەداتەوە کەپێشان هورووژاندمانن. بۆیە لێرەدا مەودا و بواری ئەوەمان نییە زێترلەسەرئەم باسە بڕۆین.

کاك فازڵ لە ل٢٤٩ دا دەنووسێت: "لەزەمانی خرۆشۆف دا، باقرۆف و پیاوەکانی لەکارخران".

تەنها لەکارنەخران، بەڵکە لەگەڵ سەرۆکی دەزگەی جاسووسیی سۆڤیەتدا، بەتاوانی خیانەت و سیخوڕی لەداریشدران. (٤١)

لە ل٢٥٤ دا، باسی پیلانەکەی شەواف و سەرکوتکردنی دەکات، بێئەوەی نێوی شەواف و کاتی پیلانەکە و شوێنی پیلانەکە بهێنێت، کە بۆ خوێنەرێکی ئاڵەمانی زمان و کەسانی نەشارەزا بەمەسەلەکە، سەرگێژکەر و ئاڵۆزە. بۆیە دەبا نووسیبای "پیلانی شەوافی ١٩٥٩ لە موسڵ".

لەل ٢٦٠ دا دەنووسێت: "یەکێك لە نێودارترین کوردۆلۆژەکانی شوورەوی دەنووسێت: (دیمۆکراتخوازەکانی میللەتی کورد، چاك دەزانن کە تاکە ڕێگەی چارەسەری کێشەی کورد، بەیەکخستنی خەبات لەگەڵ هێزە

پێشکەوتنخوازەکانی ئێران و تورکیا و عێراقدا دەکرێت، بەوەی بەرەیەکی هاوبەش لەپێناوی ئاشتی و دیمۆکراتێتیدا بهێننەکایەوە)".

بریا نووسیبای ئەو کوردۆلۆژە نێودارە کێیە.

"شۆڕشی ١٩٦١-١٩٧٥ ی کورد، درێژخایانترین شۆڕشی مێژووی نوێی کورد بووە. لەوخەباتەدا کە بە شەڕڕاگرتن و گفتوگۆی چەندین جارە لەگەڵ ڕژێمدا و هەتا بەشداربێتیش لە حوکمدا، بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد، بووە یەکێك لە هێزە سەرەکییەکانی عێراق.

هەرلەوسەردەمەدا چەندین بزووتنەوەی دیکە لە ناوچەکەدا سەریانهەڵدا، وەك بزووتنەوەی ئێریتیریا و فەلەستین و عوممان. ئەمانەش بوونە هێزێکی نوێ لە ناوچەکەدا و هێدی هێدی لەسەر ئاستی پەیوەندییە جیهانییەکان، تایبەت لەململانێی دووزلهێزەکەدا، بوونە هۆ و ئامرازێکی حسێب بۆکراو.

شوورەوی توانی لەڕێگەی ئەم هێزە تازە سەرهەڵداوانەوە، گوشار بخاتەسەر تاکەتاکەی ڕژێمەکان. بەتایبەت لەسەروەختی حوکمڕانیی برێژنێڤدا، سۆڤیەت ستراتیژییەکی درێژخایانتری پێشچاوگرت، وەك لەسەردەمی حوکمڕانانی بەرلەخۆیدا.

بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد، لەوخەباتە درێژخایانەیدا، نەك تەنها بووبووە هێزێکی بەرچاو و حسێب بۆکراو، بەڵکە بووە هێزێك کەماوەیەکی دوورو درێژ فەرمانداری ڕاستەقینەی مەڵبەندە کوردییەکانی عێراق بوو، تا ئەو ئەندازەیەی بووبووە دەوڵەتێك لە دەوڵەتێکدا. بزووتنەوەکە لەتەك ئامانجە نەتەوەییەکانیدا، هەوڵی هەڵتەکاندن و گۆڕاندنی باری سیاسی عێراقی دەدا و تین و تاوێکی هێجگار زۆری لەسەر هەڵوێست و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی عێراق هەبوو.

بەشێوەیەك کە لە شێستەکاندا، شۆڕشی کورد، یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکان و ڕێخۆشکەرێکی ئەو هەمووکودەتا و ئاڵوگۆڕانە بوو کە

لەعێراقدا ڕوویانداو وولاتەکەیان لەبارێکی ئاڵۆزدا گێژدەدا. هەرچەندە بزووتنەوەی کورد بەهۆکاری ئێتنی و بەرهەڵستی جوگرافیایی، نەیتوانی دەستەلاتی عێراق بگرێتە دەست، بەلاّم توانی ڕژێمەکە چەندینجار بخاتە بەر بوومەلەرزەی سیاسییەوە و تین و تاو و کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هەبێت. لەو ڕێگەیەوە گەلەك هێزی ناوچەیی و جیهانیی ناچاری پەیوەندیی بەستن بوون لەگەڵ بزووتنەوەی نیشتمانیی کورددا، سۆڤیەت و ئەمریکا لەو بوارەدا گرنگترین و گەورەترین ئەو هێزانە بوون.

جگەلەوە شۆڕشی کورد کوانووی ئازادیخوازانی ناوچەکە بوو، سایە و پەنای گشت ڕەدوونراوێك و هەڵهاتوو و لێقەوماوێك بوو، بەتایبەت و پلەی یەکەم پەنا و پایەی چەندینجارەی کۆمۆنیستە عێراقییە ڕەدوونراوەکان بوو، کە زۆرجاران پێستی خۆیان لە دەباخانەی ڕژێمەکانی عێراق قوتارکرد و گەیشتنە کوردستان و پارێزران، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا، یەکێك لە هۆکارەکانی کۆمەك و پشتگیریی شوورەوی بوو لە شۆڕشەکە.

پەیوەندییەکانی کورد و سۆڤیەت لەو سەردەمەدا، دووچاری گەلەك کزی و لاوازی و هەڵبەز و دابەز بوون. تا ئەو ڕادەیەی کە بزووتنەوەی کوردایەتی ناچاری ئەوەبێت کە پەیوەندیی لەگەڵ ئەمریکا و وولاتانی سەر بە ئەمریکای وەك ئێران و ئیسرائیلدا گریّ بدات. بەلاّم ئەو پەیوەندییانەی نێوان سۆڤیەت و کورد کە لە ١٩٦٣ وە تا ١٩٧٤ بڕیانکرد، قەت و قەت قرتاندنی تەواو و لەبارچوونیان بەخۆوە نەدیت و هەمیشە لەوپەڕی ئاڵۆزیشدا، تاڵە باریکەیەك لەنێواندا هەرهەبوو".

پاشان نووسەر لەژێر سەردێڕی (هەڵوێستی دووفاقانەی سۆڤیەت) دا، گەشتێکی مێژوویی بە ڕووداوەکاندا دەکات. بەپێویستی دەزانم پوختەیەکی بۆ خوێنەران ڕاگوێزم:

"ئەوکاتەی کلپەی بڵێسەی شۆڕشی کورد دژی قاسم هەلایسا، پەیوەندیی نێوان قاسم و پارتی کۆمۆنیستیش تاڕادەیەك شێوابوو. قاسم لەترسی خەتەری کۆمۆنیست، ڕووی پیشانی ڕۆژئاوا دەدا. هیچکات سیاسەتی سۆڤیەت بەرامبەرقاسم دوژمنانە نەبوو و بەردەوام هەوڵدەدرا لەگەڵ کورد و کۆمۆنیستدا نێوانیان خۆشکرێتەوە، تا ڕژێمەکە لە ڕاسترەوی بپارێزرێت و لە ڕوخان قوتارکرێت. چونکە ئاشکرابوو، قاسم بەدژایەتی کورد و کۆمۆنیست جێپێی خۆی بنکەل دەکرد. لەوکاتەدا بۆشوورەوی بەدیلێکی چاکترلەقاسم، لەئارادا نەبوو.

لە کۆتایی ١٩٦١ دا، بەهۆی گەلەك کێشەوە، قاسم لەسەرئاستی ناوچەکە دابڕاو و کەنارکەوتوو بوو. جگەلە کێشە ناوچەییەکان، گرنگترین ئەو کێشانە کێشەی شیرکەتەکانی نەوتی ئینگلیز و کێشەی کوێت بوو، کەقاسم بەبەشێك لە پارێزگەی بەسرەی دادەنا و داوای خستنەوەسەرعێراقی دەکرد.

هەڵوێست بەرامبەرقاسم، یەکە کێشەی نێوان پارتی کۆمۆنیست و پارتی دیمۆکراتی کوردستان بوو. کۆمۆنیست، هەرچەندە ڕەخنەشیان لە ڕژێمی قاسم هەبوو، بەلام پێیانوابوو، مادام ڕژێمێکی دژبە ئیمپریالیزمە، ئیدی نابێت بەبەرەکانی و دژایەتی بکرێت. بۆیە بەردەوام سەرانی پارتیان بە کورتبین و ناسیۆنالیست، تاوانبار دەکرد.

کۆتایی ١٩٦٢ لە ئاکامی بەتینبوونەوەی پەیوەندییەکانی نێوان شوورەوی و ڕژێمی قاسمدا، شوورەوی ڕاسپێرێکیان بۆلای بارزانی نارد، داوایانلێکرد ئەو توانا شۆڕشگێڕانەیەی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد دژی ڕژێمانی تورکیا و ئێرانی سەربە خۆرئاوا بەگەڕخات، چێترە لەوەی دژی ڕژێمی دژ بەئیمپریالیزمی قاسم هەڵیسووڕێنێت.

فێبریوەری ١٩٦٣، لەسەرئەنجامی کودەتا خوێناوییەکەی بەعس و ناصرییەکاندا، ڕژێمی قاسم سەرنگوم کرا. لەسایەی ڕژێمی نوێدا، هەزاران کۆمۆنیست قڕکران. ڕژێم تاکتیکی گفتوگۆی لەگەڵ شۆڕشی کورددا هەڵبژارد، تا بەدەمیانەوە بگرێت و جێپێی خۆی پتەوکات. سەدان کۆمۆنیست ناچارانە بۆ کوردستان هەڵهاتن. بارزانیی داڵدەی دان. بەلاّم هەندەك لە باڵەکانی دیکەی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد، دژی ئەو پەنادانەیان بوون.

پەیوەندیی کورد و شوورەوی کە لە دوا مانگەکانی حوکمی قاسمدا پسابوو، سەرلەنوێ گرێدرایەوە. سۆڤیەت مەبەستی ئەوەبوو جێپێیەك بۆ پارتی کۆمۆنیست لە شۆڕشەکەدا بکاتەوە، تا پێکرا دژی ڕژێمی نوێ بەگەڕیانخات، چونکە ڕژێمی نوێ گەورەترین زەبری لە بەرژەوەندییەکانی شوورەوی وەشاند، بەهێزترین پارتی کۆمۆنیستی ناوچەکەی داپڵۆسی و زۆری ئەندامانی کوشت، نێزیکترین هاوکاری لە ناوچەکەدا سەرنگوم کرد. بۆیە شوورەوی لەو دەمەدا چاکترین ڕووی پێشانی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد دەدا و لە بلاّوکراوەکانیدا پشتیوانیی خۆی بۆ بزووتنەوەکە دەردەبڕی.

سەرەتای ژونی ١٩٦٣ ، جەنگی نێوان کورد و ڕژێمی عێراق دەستیپێکردەوە، سۆڤیەت لە پڕوپاگەندە و دەزگەکانی ڕاگەیاندنیدا پشتگیری تەواوی لە میللەتی کورد دەکرد و دژی لەنێوبردنی کورد لەلایەن ڕژێمی فاشیستیی عێراقەوە وەستایەوە. ڕژێمی عێراقی بەوە تاوانبار دەکرد، کە بە کۆمەك و چەکی نوێی ئینگلیز، جەنگێکی دڕندانە دژی کورد بەڕیادەکات.

سۆڤیەت کۆمەکی ماددی و مرۆڤانەی زۆری بۆ کورد بەڕێکرد. هەروەها خاچی سووری هەنگاریا و ئاڵەمانیای دیمۆکرات و چیکۆسلۆڤاکیا، کەوتنەخۆ و دەست و دڵیان والا بوو.

گرنگترین ڕووداوی ئەو سەردەمە، ئەو هەنگاوە بوو کە شوورەوی لەسەر ئاستی دیپلۆماسیتیی جیهان هەڵینا. ئەوەبوو لە ژولی ١٩٦٣ دا مەنگۆلیای ڕاسپارد کە داد و هاواری کورد بگەیەنێتە کۆبوونەوەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان. ڕژێمی عێراق خەریکی تەونکردنی پیلانی هاریکاریی سوپایی بوو لەگەڵ ڕژێمانی ئێران و تورکیا و سوریادا. بۆیە گرۆمیکۆ ئەو وولاتانەی لەوەبەرگرتنی هەنگاوێکی لەو بابەتە بەهۆشهێنایەوە.

کۆتایی سێپتەمبەر، برایم ئەحمەد سەردانێکی مۆسکۆی کرد. بەگەرمی پێشوازیی لێکرا. لەپاڵ کۆمەکێکی ماددی زۆردا، وێزگەیەکی ڕادوێی پێدرا و گفتی گەلەك یارمەتیی دیکەشیان دایە.

ئەو کۆمەك و پشتگیرییە پڕوپاگەندەییەی سۆڤیەت و وولاتانی سۆسیالیست بە کوردیانکرد، مەسەلەی کوردی زێتر بەجیهان ناساند.

لــــه نۆڤەمبـــەری ١٩٦٣ دا، ڕژێمـــی بـــەعس لەلایـــەن عـــارفی نـاصـــرییەوە هەڵگێڕدرایەوە. سۆڤیەت هیوای لەسەر ڕژێمی نوێ هەڵچنی. هەرچەندە ڕژێمی عـارف هـیچ ڕوویـەکی دۆسـتانەی ئـەوتۆی پیشانی سـۆڤیەت نـەدا، سەرەڕای ئـەوەش پەیوەنـدیی ئـابووری نێـوان هـەردوو وولاّت خۆشکرایەوە و قۆرخانـەی چەکی سۆڤیەتی بۆ عێراق ئاواڵە کرایەوە.

ڕژێمـی نـوێ ئـارەزووی دۆزینـەوەی چارەسـەرێکی ئاشـتییانەی کێشەکەی نیشان دا. ناصر لەپشت ئەو هەڵوێستەی ڕژێمەوە بوو. شوورەوی ئافەرینی لـەو هـەنگاوەی نـاصـر کـرد. پـارتی کۆمۆنیـستی عێـراق ناچـارکرا بـە ئـەرێتی لـەو گۆڕانکارییانـەی ڕژێـم بڕوانێـت، چـونکە ئاشـتبوونەوەی کـورد و ڕژێـم، ڕەنگـە جێپێیەك بۆ سۆڤیەت بکاتەوە.

ســەرەتای ١٩٦٤ ، سـۆڤیەت نێوبـژێوانی نێـوان کـورد و ڕژێـم بـوو، کـە لـە فێبریوەری هەمانساڵدا بەشەڕ ڕاگرتن کۆتایی پێهات. هەرچـەندە ئەو مافانەی ڕژێم دانیپێدانابوو، لەوانـە کەمتربوون کـە ڕژێمی پێشین پێشچاوی خستبوون، بەلاّم سۆڤیەت پشتگیریی لەو ڕێککەوتنە کرد و بارزانی ناچارکرا پێیڕازیی بێت.

باڵی برایم ئەحمەد و زۆربەی کۆمیتـەی نێوەندیی پارت، بەو ڕێکەوتنە ڕازیـی نـەبوون. ئەمـە بـووە هـۆی دووبـەرەکی ڕیزەکـانی بزووتنـەوەی نیـشتمانیی کـورد. لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە پرۆگرامـی بـرایم – جـەلال زێتر بـەلای چەپدا دایدەشکاند، کەچی سۆڤیەت پشتی باڵەکەی بارزانی دەگرت".

لێرەدا ناچارم قەتماغەی برینێك هەڵدەمەوە و ئەم چوار پێنج دێرەی كاك فازڵ ویستوویە هەروا سووك و ئاسان بەسەر خوێنەریدا تێپەڕێنێت، دەیخەمە بەرتاوی باس و لێكۆڵینەوە و شیكردنەوەوە.

لەكارێكی زانستانەی ئاوهادا، هەقە ڕاستیی ڕووداوەكان چۆنن، وەها پێشچاوخرێن، دوورلەتین و تاوی سۆن بێ ڕتووش و دەستكاری، چونكە لە ڕووداوێكی ئاوها گرنگدا كە مێژوویەكی هێند دووری نییە تا وەچەی ئێمە لەیادی كردبێت، ناتوانرێت هەروا بەخشەی قەڵەمێك زۆر ڕاستیی قلْپكرێنەوە. خوێنەری كەمەك ئاگاداری ڕووداوەكان ، لەقۆرتی ئاوها هەڵدەنووتێت. بۆیە من بەئەركی خۆمی دەزانم لەنگیی ئەم پەرەگرافە ڕاستبكەمەوە كە بەچەند دێرێك مێژووی سەردەمێكی میللەتەكەمان و ڕەوڕەوەی وەرچەخێنراوی پاشەڕۆژیشی لنگەوقووچ كردۆتەوە. كاك فازڵ كەسێك نییە نەشارەزا و لاتەریكی ئەو سەردەم و واقیعە بێت. بۆیە ناڵێم گومان دەكەم ، بەڵكە بەتەواوی دڵنیاییەوە دەڵێم كە بە ئارەزوو دەستی ئەنقەست و بەتین و تاوی سۆزێكی پەتیی ئەوناڕەواییە دەكات.

ئێمە ناچارین ئەم پرسیارانە بەرەوڕووی كاك فازڵ بكەینەوە:

١-داخۆ هۆی ڕاستەقینەی دووبەرەكیی نێو بزووتنەوەی كوردایەتی و ڕیزەكانی پارت، ڕێكەوتنەكەی شەست و چواری "موشیر- بارزانی" بوو؟

٢-ئایا بەڕاستی ئەو باڵە سەرەڕۆیە بەڕێكەوتن ڕازیی نەبوون؟ یاخود ئەو كاسەیە بێكاسە نەبوو؟

٣-ئایا بەڕاستی ئەو باڵە چەپیی بوون؟ یاخود بانگاشەی پەتیی بوو بۆ لاوازكردنی باڵی بارزانیی و پتەوكردنی جێپێی خۆ؟

هێندەی مەودای باسەکە بیگرێتەخۆو سەرچاوە تۆمارکراوەکان و بیرەوەریی گەواهە بەچاودیتووەکان دەستگیرۆییمان بکەن، هەوڵدەدەین بەکورتی وەرامی یەکەیەکەی ئەو پرسیارانە بدەینەوە:

١-هۆی ڕاستەقینەی دووبەرەکیی ڕیزەکانی پارت ئەو ڕێکەوتنە نەبوو کە (بارزانی کوردی بە مۆزو پرتەقاڵ فرۆشت)، کاتەکەشی ڕەگ و ڕیشەی زۆر لەوە قووڵتر بوو، بەلاّم تەقینەوەکەی لەو کاتەدا تەوقیت کرابوو.

چۆن؟

مامۆستا هەژاری موکریانی لە پاشکۆی شەرەفنامەدا دەنووسێت:

"برایم کە بەنیازبوو بارزانی لەسەر ڕێ لابدات، نەدەوێراش ئاواتەکەی ئاشکراکات، لەبنەوە بەدزی و فزییەوە دژی بارزانی دەیورتاند و دەیەویست بەدناوی کات.

دوای کودەتای ٨ ی فێبریوەری ١٩٦٣ کە بەعس هاتە سەرحوکم و شەڕ وێستابوو، من لەبەغدا جەلالم دیت کە بۆ ووتووێژ هاتبوو، گوتی حیزب دەڵێت هەژار بابێتەوە کوردستان، بەڵکو نێوانی بارزانی و ئێمەی حیزب خۆشکاتەوە. کاتێ هاتمەوە کوردستان وچاوم بە بارزانی کەوت و حیزبایەتییەکەی جەلال و برایم دیت، تێگەیشتم خوار و خێچی و ڕێوی بازیی لەژێرسەری سکرتێردایە.

مانگی مارتی ١٩٦٣ ، کۆبوونەوەی پیاوماقووڵان و سەرانی شۆڕشی کورد لە شاری کۆیسنجەق پێکهات، کە داوایان لە دەوڵەتی بەعس چیبێت؟ لەوکۆڕەدا هەر دڵسۆزێك هەستی دەکرد کە برایم و هاواڵەکانی تەنیا مەبەستیان ئەوەیە لە

شـۆڕش و بــارزانی دوورکەونــەوە و پلــە و پایەیــەك لەدەوڵــەت وەربگــرن و دەستهەڵبگرن.

لەهەرەمەی کۆنگرەدا دەیانەویست لایەنگرانی بارزانی بە پوول بکڕن و دەگژ سـەرۆکیان ڕابکـەن. پووڵیـان لـە کوێـوە هێنـا بـوو؟ دەرکـەوت هـەر لەمێـژە بەدزییەوە دەگەڵ دەزگای شای ئێراندا کەین و بەینێکیان کردووە. چەك و پـوولی لێوەردەگرن و دژی مستەفا بـارزانی کـە دوازدە سـاڵ لـە نـاو عروسـایەتی ژیـاوە و کۆمۆنیستێکی خەتەرە، خەبات بکەن.

لـە هـاوینی ١٩٦٣ دا،کەهـەموو گرانـایی شـەڕ لەسـەر مەڵبەنـدی بـارزان بـوو، برایم نەیهێشت پێشمەرگەی بـەرفـەرمانی لەکەرکوك و سلێمانی و هـەولێرەوە بــچنە شــەڕی حوکومــەت و بارێــك لەســەر بــارزان ســووککەن. لــەوەرامی پێشمەرگەی دڵسۆزدا دەیگوت : با بارزانی لـەنێو بچێ، ئەوسـا سـەرکردایەتی شۆڕش دەبێتە یەك، وێنەی بارزانی شەهیدیش بەپووڵێکی زۆر دەفرۆشین". (٤٢)

کەواتـە وەك گێڕانـەوەی ئـەم بیرەوەریانـە دەریدەخـەن و هـەموو شـارەزایەکی حاڵوبارەکەش دەزانێـت، مێـژووی دووبەرەکیی پـارت بنـاوان و ڕەگ و ڕیـشەی لـە ڕێککەوتنەکەی ٦٤ ی موشیر- بارزانی قووڵترە و ماکی دیکەی هەیە.

ئـەوان لـەو کـاتـەدا بەگشتی و خەسـت و خـۆڵی، دوو خـاڵی زەقیـان دایـە ژێـر زەرەبین:

١-بـارزانی حیزبایـەتی و ڕێکخستن و دیسپلین نـازانێت و بـاوەڕی پێـی نییـە و پەیڕەویی ناکـات، کـە تـاڕادەیـەك ڕاسـت بـوو. ئـەو سـەرکردەیەکی تەقلیـدیی و پاڵـەوانێکی میللـی بـوو، کەلـە شۆڕشـی چـەکدارانەی میللەتەکەمانـدا، ڕۆڵێکـی

درەوشاوەی گەشی دیتبوو. باڵی برایم و دار و دەستەکەی هەر لە سەرەتاوە سوودیان لە نێوبانگو شۆرەتی ئەو وەرگرتوو لە پاڵیدا ڕەگی خۆیان داکوتا. پاشان کە خۆیانگرت و دیتیان جەماوەرێکی زۆر لەدەوری پارتە و بارزانییش زۆر گوێ بە فەرمایشتی ئەوان نادات، ویستیان هەڵیدێرن و خۆیان جێیبگرنەوە. بۆیە هەوڵیاندەدا خۆڵ لەچاوی جەماوەرەکە بکەن، دەنا وەکی پێشان ڕوونمانکردەوە، هەر ئەو مامۆستایانە خۆیان، بۆ دیسپلین ژێرپێخستنی بارزانی لە چەپڵەیاندا، کاتێك هەمزە عەبدوڵڵای سکرتێری حیزب و ملۆزمی ئەوانی لە ڕیزی پارتی بەدەرنا و ئەوانی لە جێگە داکرد.

٢-ئەوان بەڕێککەوتنی ١٩٦٤ ی بارزانی ڕازیی نەبوون، (پاشان دێمە سەر هۆی ڕازیی نەبوونیان)، ئەوەبوو لەنێو خەڵکدا بەگاڵتەجارییەوە کردیانە قاو، کە گوایە بارزانی کوردی بەمۆز و پرتەقاڵ فرۆشتووە. نامیلکەیەکیشیان لەسەر نووسی بەنێوی (اتفاقیه المشیر- بارزانی، اصلح ام استسلام)ەوە.

لە کۆنفرانسەکەی ماوەت دا، کە لەنیسانی ١٩٦٤ دا سازکرا، برایم ئەحمەد دەیگوت من مەلا مستەفام بە بەیانێك کردۆتە مەلا مستەفا، بە بەیانێکیش دەیکەمەوە بەهیچ. نابێت ئەوەش لەیادبکەین کە ئەو باڵە، خۆیان لە هەموولایەك زێتر هەڵپەی گفتوگۆ و ڕێکەوتنیان بوو، بەو هیوا و ئاواتەی کەلەسایەی ڕێکەوتندا پلە و پایەیەکی بەرچاویان لە حوکمدا چنگکەوێت.

تاڵەبانی ئەو کاتانە کۆتری ئاشتیی شۆڕش بوو، بەردەوام فڕکەی دەهات، کاتێك ئەو لە پایتەختی وولاتانی عارەبدا خۆی دەخلافاند و بە دیار لامەرکەزییەکی کەڕاوییەوە هەڵدەتووتا، مندالانی سلێمانی ڕێگەیان

نیشانەدا و شیعریان پێداهەڵدەگوت: (مامجەلال قاچت تەزی، نامانەوێ لامەرکەزی)، بەلام ئەوێك کە قاچی گفتوگۆ و ووتووێژی، قەت و قەت سڕبوون و گۆتبوون و تەزین نازانێت، دەهاتەوە بەزمانی پارێزەران دەدوا و دەیگوت: (لامەرکەزی نێوەرۆکەکەی حوکمی زاتییە).

هۆی چبووبوا ئەوانی کوشتەی گفتوگۆ و ڕێکەوتن، لەپڕ بەو ڕێکەوتنەی بارزانی رازیی نەبوون؟

ئەو دەمە ناصر وەکو ڕێبەرێکی پان عارەبیزم، سەرسەختترین دوژمنی پان ئێرانیزم بوو. عارف لە عێراقدا شێلگیرترین نوێنەری ئەو ڕێبازە بوو، داوای سەندنەوەی خوزستان و ئەسکەندەروونەی دەکرد. بەڕێکەوتنی کورد لەگەڵ ڕژێمەکەیدا، ئارامی و ئاسایش لە وولاتەکەدا دەسازا و مەترسی بۆسەر ئێران زیادی دەکرد. جگەلەوە، ئەو کاتانە پەیوەندیی نێوان شۆڕش و شوورەوی لەویەڕی چاکی و پتەویدا بوو. بارزانی داڵدەی کۆمۆنیستانی دابوو. سۆڤیەت و ناصریش پشتگیریی ئەو ڕێکەوتنەیان دەکرد. ئەوانە هەمووی زەنگی خەتەر بوون بۆ ئێران.

هەژاری موکریانی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (لەبەهاری ١٩٦٢ دا، لەسەر ڕاسپاردەی بارزانی لە بەغدا چاوم بە سەفیری میسر کەوت. پەیامی بارزانیم دایە، بەو مەرجەی عەبدولناصر کارێك بکا عێراق لەشەڕ دەستهەڵگرێ، میسریش کەمێك چەکی دژەفڕۆکە و تانکمان بداتێ، شۆڕش دەبەینە ناو ئێران کە هاوپەیمانی سەنتۆیە و ناصر گەرەکییە لاوازبێت. ناصر نەیکرد).

بۆیە ئێران بەهەموو توانای هەوڵیدەدا، بەربەو ڕێکەوتنە بگرێت و بارزانی لەسەر ڕێگە لابدات. ئەو دەمە سەرهەنگ عیسا پەژمان، کە ئەفسەرێکی ساواکی بوو، بەخۆی و بێسیم و نەفەرێکەوە کەلای پێشمەرگە بە عەباس بێتەل ناسرابوو، بارگە و بنەی لە ماوەت لەخزمەت مەکتەبی سیاسیدا خستبوو. عیسا پەژمان لەو ماوەیەدا زۆر بەگەرمی دەربارەی پێویستیی سەرکەوتنی حیزب (باڵی برایم – جەلال)، بەسەر عەشرەتی بارزان و شیوعییەکاندا دەدوا. بەگوتەی نوری ئەحمەدی تەها، پەژمان ١٠٠ تفەنگی بۆ مەکتەبی سیاسی گەیاندە ماوەت و بەڵێنی دێرینەی دووپاتکردەوە کە حوکومەتی ئێران لە گشت شەڕێکی دژە بارزانییدا پشتیاندەگرێت. مەکتەبی سیاسی بەو گفت و بەڵێنانە، زۆرلە خۆبایی بوون).

ئەوەبوو مەکتەبی سیاسی لە نیسانی ١٩٦٤ دا کۆنفرانسێکی لە ماوەت گرت، کە عیسا پەژمانیش تێدا بەشداربوو. لەو کۆنفرانسەدا بڕیاری بەدەرنانی بارزانی لەڕیزی حیزبدا، درا.

بارزانی لە هاوینی ١٩٦٤ دا لێیانڕاپەڕی و کردنی بەدیوی ئێراندا. سەرەتا، ساواك لە سەربازخانەکانی کوردستانی ئێراندا ڕایگرتن، دووجاریش هێرشی پێکردنەسەر بنکەکانی پێشمەرگە.

ساڵی ١٩٧٩، کەسێکی ئاگاداری وەزعەکە، کە ئەوکاتە خۆی لەگەڵ بارزانیدا بوو، ئەو ڕووداوانەی بەمجۆرە بۆ گێڕامەوە: (چەکدارەکانی مەکتەبی سیاسی هێرشیان بۆسەر بنکەکانی پێشمەرگە دەهێنا و یەکەم خشتی بناغەی شەڕی براکوژییان بە پیلانی ساواك داچنی. بارزانیی گەشتێکی بەناوچەکانی

کۆنی ژێردەستەلاتی مەکتەبی سیاسیدا کرد. چووینە گوندی بناوەسووتەی پێنجوین. لەماڵی مامۆستا قانیعی شاعیر داوەتبووین. بارزانی ناردی بەدووی موختاری گوندی باداوەی ئەوبەری سنووردا، داوایلێکرد بەلێپرساوانی ئێران ڕابگەیەنێت، گەرجارێکی دی چەکدارەکانی مەکتەبی سیاسی، یەك فیشەك بەمدیودا بتەقێنن، هێزەکانی خۆی ڕادەسپێرێت، گەرپێویستی کرد تا تاران هەڵیانبڕن).

پاش ماوەیەك ئێران، چەکدارەکانی مەکتەبی سیاسی کێشایەوە، سەرکردەکانی بردنە تاران وئەوانی دیکەش لە بەنگەڵەکانی کارخانەی شقارتەی هەمەدان داکران.

سەیرئەوەیە، ئەوتاقمە پاش گەڕانەوەی عێراق و دانەپاڵ حوکومەتیان، مەسەلەی پەیوەندیی شۆڕش لەگەڵ ئێرانیاندا کردە گەورەترین بەڵگە و بیانووی دابڕینیان لەسەرکردایەتی بارزانی، وەکو ئەوان خۆشیان ئەو یەکەم هەنگاوەیان نەنابێت. ئەوەتا دانا ئادەم شمید لە کتێبی (گەشتێك بە وڵاتی ئازایاندا) دەڵێت: "برایم ئەحمەد چەند مانگی کۆتایی ١٩٦٣ وسەرەتای ١٩٦٤ ی لە ئەورویا بردەسەر وتوانی وەك جەلال تاڵەبانی، ڕێگەی چوونەدەرەوەی وڵات بەڕێگە وشێوەیەك پەیداکات کە دەبێت بەنهێنی بمێنێتەوە". ئاشکرایە ئەوڕێگە نهێنییە کوێ بووە.

لەوەش سەیروسەمەرەتر ئەوەیە، پاش چوونە بەغدایان، سەرهەنگ عیسا پەژمانیش کرایە ئاتاشێی سوپایی باڵوێزخانەی ئێران لەبەغدا. ئەودەمە زێتر ئەوڕەحمانی زەبیحی پەیوەندیی پێوە دەکرد. جگەلەوە بەردەوام کاربەدەستانی

ساواکیی وەك دوکتۆر هاشمی شیرازی و کەسانی دیکە بەنێوی نهێنی دوکتۆر جەلال و کێ و کێوە دەهاتنە بەکرەجۆ و لای خەڵکی بە فیدائی ئێرانی پەیڕەوانی بیری ماوی دەناسرێنران، کە گوایە خەباتگێڕانی دژەڕژێمی شان. گوایە دوکتۆر جەلال، پزیشکیی سروشتیی لە چین خوێندووە و لە ڕووەکە سروشتییەکان داو و دەرمان دەگرێتەوە و چارەی لادێییە هەژارەکانی پێدەکات.

کەواتە وەك کاك فازڵ نووسیویە، شوورەوی پشتی بارزانی دەگرت، هەرچەندە پرۆگرامەکەی برایم ـ جەلال بەلای چەپدا دایدەشکاند. ڕاستە بەلام چەپێتی تەنها ووشەی بێگیانی سەرکاغەز نییە، بەڵکە کارە، کردەوەیە، هەستە، بیرە، مامەڵەیە.

پەیوەندیی ئەو تاقمە بەئێرانەوە و هەڵوێستیان بەرامبەر پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە کوردستاندا، ئەو هەڵوێستەی بە شوورەوی وەبەرگرتبوو.

گۆڤاری الکاتب ی میسریی لەژمارە ٥٠ ی،ساڵی چوارهەم، ئایاری ١٩٦٥ دا، گفتوگۆی مانگێك بەرلەوسای سێ وەفدی عارەبی بلاوکردەوە، کە لە قاهیرە دوو زنجیرە کۆبوونەوەیان کردبوو، کێشەی کورد یەکێك بوو لە باسەکانیان. لەیەکەم کۆبوونەوەدا ئەدیب ئەلجادر، یەکێك لە ئەندامانی وەفدی عێراق دەڵێت: "لەدوا کۆبوونەوە لەگەڵ نوێنەرانی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتدا، باسی وەزع و هەڕەشەی ئیمپریالیزم و بەتایبەت ئێرانمان لەگەڵ هێنانەپێش، کە چۆن ئیستیعمار هەوڵی هاندانی کورد دەدات، تا عێراق بخاتە بەرمەترسییەوە. پێمانگوتن کە ئێمە بەڵگەمان دەربارەی پەیوەندیی کورد و هێزە

ئیمپریالیستەکان بەدەستەوەیە. گوتیان ئەوانیش لایانوایە کە ئەوپەیوەندییانە هەن، بەڵام لەگەڵ مەلامستەفای بارزانیدا نا.

هەژاری موکریانیدەنووسێت: "کۆمۆنیستی عارەب و کورد، ئەوانەی لەقەتل و عامی بەعسییەکان رزگاربووبوون و شۆڕشی کورد پەنای دابوون، ئامادەبوون بەچەك و ئازووقەی خۆیان، بۆ پارێزگاریی لە گیانیان، هاوسەنگەری پێشمەرگەبن. برایم لەچەکی کردن. بارزانی چەند نامەی بۆنارد چەکەکانیان بداتەوە، (هەشت نامەیان بەمن نوسرا)، چەکەکان هەر نەدرانەوە".

وەك نووسەرخۆشی لە ل٢٨٥ دا نووسیویە، برایم ئەحمەد لەسەردانەکەی ١٩٦٣ ی مۆسکۆیدا، بەو هەمووتکا و ڕجایەی خانەخوێکانیشی، ئامادە نەبوو لەگەڵ کۆمۆنیستی عێراقدا پێکبێتەوە.

لە حاڵوبارێکی ئاوهادا، وولاتێکی وەك سۆڤیەت کە ئەم ڕاستییانە چاکترو قووڵتریش دەزانێت، جگەلەوە هەڵوێستی بارزانی زێترلەبەرژەوەندیی ئەوان بوو، سەرکەوتنی ئەوو دۆڕاندنی باڵەکەی دیکەشیان لا ڕوون بوو، دیارە هەریشتی بارزانی دەگرن.

نووسەرخۆشی پەنجەی بۆئەوە ڕاکێشاوە و دواتر دەنووسێت: "چەند رۆژێك پێش ڕێکەوتنەکە، پراڤدا دەنووسێت کە هەندێ داروەدەستەی ئیمپریالیزم دەیانەوێت ڕێ بەو ڕێکەوتنە بگرن و بەردەوام ئاگری شەڕ خۆشدەکەن، تا عێراق بەوکێشەیەوە هەربناڵێنێت. مەبەستی پراڤدا، ئێران بوو".

با بگەڕێینەوە سەرباسەکەی خۆمان:

ئاژانسی دەنگوباسی تاس، پشتگیریی لەو ڕێکەوتنە کرد و خرۆشۆف بروسکەی پیرۆزبایی بۆ بارزانی و عارف نارد. پارتی کۆمۆنیستی عێراق، سەرەتا هەڵوێستێکی ڕەخنەئامێزیان هەبوو، پاشان لەژێر تین و تاوی ڕای سۆڤیەتدا، بایانداوە.

ساڵی ١٩٦٥ شەڕ هەڵگیرسایەوە، شوورەوی پشتی کوردی بەرنەدا، هەمانکات پەیوەندیی لەگەڵ ڕژێمیشدا هەر بەردەوام بوو. سۆڤیەت زۆر بە ووریایی و ئاگادارییەوە لەڕووداوەکانی ١٩٦٦-١٩٦٨ ی عێراقی دەڕوانی. بەرازو تاڕادەیەك میراتگرەکانیشی مەیل و ئارەزوویان بەلای ڕۆژئاوادا نیشاندا.

سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەم سەروەختەدا داوی پەیوەندیی لەگەڵ چەند هێزێکی دەرەکییدا ڕایەڵکرد، تایبەت لەگەڵ ئێران و ئیسرائیلدا.

سەرەڕای ئەوەش شوورەوی هەر پشتگیریی لە بزووتنەوەکە دەکرد. هەتا لەپاڵ کۆمەکی ماددی ڕۆژئاوادا، ئەوانیش کۆمەکی ماددیان پێدەدا.

لێرەدا دەمەوێت دەمەتەقێیەك لەسەر ئەو پرسیارە بکەم کەگەلەکجار دەبیستین: ئایا چۆن شۆڕشی ئەیلول لەیەك کاتدا پەیوەندیی لەگەڵ شوورەوی و وولاتانی سۆسیالیستدا هەبوو و کۆمەکی لێوەردەگرتن، هەمانکات پەیوەندیی لەگەڵ هەندە وولاتێکی داردەستی ڕۆژئاواشدا هەبوو؟ داخۆ شوورەوی بەو پەیوەندییانەی دەزانی؟ ئەدی چۆن لەئاستیدا بێدەنگبوو؟ چۆن بەوە ڕازیبوو؟

ئەمانە و چەندین پرسیاری دیکەی لەو بابەتە بەرۆك بە مرۆ دەگرن و چاوەڕێی وەرامن. بۆیە من هەوڵدەدەم وەرامێکی کورتیان بدەمەوە:

دەبێت ئەو ڕاستییە دووبارەکەینەوە، کە میللەتێکی زۆرلێکراو نییە، هێندەی کورد گەمارۆدراو و هەڕەشەلێکراو بێت. هەڵکەوتی جوگرافیایی خاکەکەی، چەندە بۆ خۆپارێزی لەبارە و ڕێگەی ئەوە نادات کە دوژمنان بەهاسانی دەستیان پێیاندا ڕابگات، هێندەش داخراو و ئابلوقەدراو و بێدەروازە و ڕێگەیەکی ئەوتۆیە کە بتوانرێت کۆمەکی خێرخوازانی پێدا بەڕێبکرێت. بەتایبەت کوردستانی خواروو لەهەرچوار کەنارەوە خڕ بەداگیرکەران ئەڵقاوئەڵق دراوە. خۆ کۆمەك لەئاسمانەوە دانابارێت، دەبێت ڕێگەیەك پەیدا کرێت. تەنها ڕێگەش ئەوەیە کە ناکۆکی و ئالۆزیی نێو ئەو دوژمنانە بقۆزرێتەوە و سوودیان لێوەرگیرێت. چۆنیەتی و توانای ژیرانە سوود لێوەرگرتنی ئەو بارە، دەکەوێتە ئەستۆی سەرکردەکانی ئەو بزووتنەوەیە. لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا ئەو بارە ڕەخسابوو، ئەویش بەهۆی دوژمنایەتی و دژایەتی هەردوو بیری ڕەگەزپەرستی پان عارەبیزم و پان ئێرانیزمەوە و ململانێیان لەسەر خوزستان و کەنداو، داخۆ عارەبییە یاخود فارسی.

کورد ئەو کاتە لەکوردستانی خوارووودا، دژی پان عارەبیزم دەجەنگا، ئەمە خۆی لە خۆیدا بە سوود و قازانجی پان ئێرانیزم بوو، چونکە مێملەکەی بۆ لاواز دەکرد. بۆیە لەو بارە ناهەموارەی کورددا، ڕووی دۆستایەتییەکی ساختە پیشانی کورد درا. کوردیش ئەو هەلەی قۆستەوە و لە کاتێکدا ئەو دەرووەی لێکرایەوە، کە گەمارۆی ئابووری هەناسەی ئەو بەشەی خوارووی کوردستانی سوارکردبوو. دیارە شوورەویش ئەو بار و دۆخە تێدەگەیشت و دەیزانی چارەی دی لەبەردەستدا نییە. بۆیە پێیڕازی بوو، بەلام مەرجی ئەوەبوو کە بڕیار

بەدەست سەرکردایەتی شۆڕشەکەوە بمێنێتەوە بەتەواوی تەسلیم نەبن. سا لەو ڕێگەیەوە سەرپاکی کۆمەکی خێرخوازان و شەڕخوازان، بە کوردستاندا دەکرا. ڕێگەی پەیوەندیی و هامشۆی کادێران و بەرپرسانی شۆڕشەکە بوو بە بەرەی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاواوە. گشت لەگشتی کۆمەکی سۆڤیەت وولاّتانی سۆسیالیستییش، لەو کونەوە دەگەیشتە شۆڕش. هەتا سالّی ١٩٧٠ ، سەرچاوەی رزق و ڕۆزیی پارتی کۆمۆنیستی عێراقیش بوو. چاکیش پێیڕازیبوون و بەو ئازووقەیە دەژیان کە لەو کونەوە دەهات. کاتێك هاوڕێ کەریم ئەحمەد لە هەشتەمین کۆنگرەی پارت لە ١٩٧٠ دا، سەرسۆیلەی سەکۆی کۆنگرەی لە حیزبی بەعس گرت و بوغزاوی قینی بەسەردا ڕشتن، گیرفانێکی زڕەی تمەن و گیرفانەکەی دی خڕەی ئاجیلی لێدەهات. بەلاّم کە چەرخ و فەلەکی سیاسی سوورێکی دی خوارد، هەربەو پەتکە ملی کوردیان جەڕاند.

بەبۆچوونی من، ئەو کاتە شوورەوی لەبەرئەم هۆیانە بەو بارە ڕازیی بوو:

١-شوورەوی لەو کاتەدا دەیزانی هیچ چارە و ڕێگەیەکی دی لەبەردەستدا نییە، دەبێت دەروازە و درزێك پەیدا کرێت، تا کۆمەکی دەرەکی بە شۆڕشەکە بگات.

٢-بۆگوشاری زێتر خستنە سەرعێراق. بۆبەهۆشدا هێنانەوە و تێگەیاندنی کە هێزە ئیمپریالیستەکان و دار و دەستەکانیان دوژمنی سەرەکیی عێراقن و دەیانەوێت عێراق بەچۆکدا بهێنن. تا عێراق ناچاری ئەوە کرێت کە سەنگەری بەرامبەر هەلّبژێرێت و پەنا و هانا بۆ بەرەی ڕۆژهەلاّت بەرێت.

٣-بارێکی وا بێتەگۆڕێ، هەرکات بەرژەوەندیی سۆڤیەت خواستی، بێئەوەی هیچی لەسەربکەوێت، خۆی لەسەنگەری دۆستایەتی کورد بکێشێتەوە و هەتا هەقیشی بدرێتێ، ئەویش بەتاوانبارکردنی شۆڕشەکە بە کۆنەپەرست و داردەستی ئیمپریالیزم. ئەمە هەمانکات دەرفەت دەخولقێنێت کە هەرکات لەپاشەڕۆژدا بەرژەوەندییەکانی شوورەوی خواستی، سەرلەنوێ ڕووی دۆستایەتی پیشانی کورد بداتەوە و کوردیش قەرزاربارکاتەوە و هەڵوێستی بەرژەوەندپەرستانەی خۆی بەهەڵوێستی چەوت و خراپی شۆڕشەکە عەیب پۆشکات.

٤-لەحاڵەتێکی ئاوهادا، دۆستایەتییەکە لەسەر سۆڤیەت زۆر ناکەوێت، لەڕووی ماددیشەوە هەرزان بۆیدەچێتەسەر، چونکە بزووتنەوەکە تەنها چاولەدەستی سۆڤیەت نابێت و سەرچاوەی کۆمەکی دیکەشی بۆ پەیدا دەبێت، هەرهەمان دەوری زۆربۆهێنەر و گوشارخەرەسەریش بۆ شوورەوی دەبینێت، بەلاّم بەکۆمەك و تەکلیفی لایەنانی دیکە. باری سەرنجی وولاّتانی عارەبیش بەرامبەر شوورەوی و وولاّتانی سۆسیالیست تەڵخ و بەدبین ناکات.

کەواتە کاکە فازڵ چاکی بۆچووە کەنووسیویە: "پەیمانی هاوکاریی و دۆستایەتی ١٩٧٢ ی نێوان سۆڤیەت و ڕژێمی عێراق و جێپێی بوونەوەی سۆڤیەت لە عێراقدا، بەرهەم و سەرئەنجامی ئەو بارودۆخە بوو کە شۆڕشی کورد هێنایە گۆڕێ".

"ڕژێمی بەعسی وەکو هەموو ڕژێمێکی دیکەی بەرلەخۆی، لە یەکەمین بەیاننامەی پاش کودەتاکەیدا ڕایگەیاند، کە بەنیازە کێشەی کورد بەشێوازێکی

ئاشتییانه چارەسەر بكات. بەهۆی تەجرەبەی تاڵی ١٩٦٣ یانەوە، تاڕادەیەك لە ناوچەكەدا وەتاق كەوتوو و پەڕكراو بوون. بۆیە خۆنێزیكخستنەوە لەسۆڤیەت و هاریكاریی پارتی كۆمۆنیستی عێراق و ڕێكەوتن لەگەڵ كورددا، یەكەم ئامانجی تاكتیكییان بوو. هەر یەكەوڕاست پاش كودەتاكە، گوتوبێژیان لەگەڵ كۆمۆنیستاندا دستپێكرد. پارتی كۆمۆنیست دەیزانی بەعس وەتاق كەوتووە، بۆیە دەیەویست زۆری بۆ بهێنێت، تا لەبواری سیاسەتی دەرەوەدا كۆرسی خۆی بگۆڕێت. لە سێپتەمبەری ١٩٦٨ دا، پارتی كۆمۆنیست بەرنامەیەكی پێشنیازكراوی خستەبەردەستی بەعس و حیزبەكانی دی، تا لەبەر ڕۆشناییدا بەرەیەكی نیشتمانیی پێكبهێنرێت، لەخاڵی پێنجهەمدا دەڵێت: "دونیا دەكرێتە دوو بەرەوە، بەرەی شۆڕشگێڕان، كە لە وولاٌتانی سۆسیالیست و بزووتنەوە ئازادیخوازەكانی جیهان و بزووتنەوەی كرێكاران پێكدێت. بەرەی ئیمپریالیزم، بەسەركردایەتی ئەمریكا و بەریتانیا و ئاڵەمانیای ڕۆژئاوا. ئەو بەرە نیشتمانییە دەبێت بداتە پاڵ بەرەی شۆڕشگێڕان و دژبە ئیمپریالیزم بێت. دەبێت ببێتە دۆست و هاوكاری سۆڤیەت و وولاٌتانی سۆسیالیست".

بەعس لە فیكەی خۆی تێگەیی، بەرەو ئەو ئاقارە هەنگاوی نا. كە كۆنگرەی بەعس لە نۆڤەمبەری ١٩٦٨ دا گیرا، گەورەترین وەرچەرخانی سیاسی لەمێژووی خۆیدا تۆماركرد: "كۆنگرە بڕیاردەدات كە سیاسەتی دژبەئیمپریالیزم و كۆلۆنیالیزم وەبەربگرێت و دۆستایەتی خۆی لەگەڵ وولاٌتانی سۆسیالیستدا بەتین بكات".

هەر ئەو ساڵە ئەو بڕیارە خرایەگەڕ. پەیوەندیی ئابووری لەگەڵ شوورەوی و وولاتانی سۆسیالیستدا پەرەی پێدرا. سیاسەتی دەرەوە لەسەر ئاستی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست و وولاتانی عارەب، لەگەڵ ستراتیژیتی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا، هاوتەریب کرا.

ئیدی هەلی زێڕین بۆ سۆڤیەت هاتەپێش، تا جێپێی لەدەستچووی عێراقیان گیرکەوێتەوە. وا پێویستی دەکرد کەپارتی کۆمۆنیست لە حوکمدا بەشداریی بکات و بزووتنەوەی نیشتمانیی کوردیش لەگەڵ ڕژێمدا ڕێککەوێت و پەیمانی ئاشتی ببەستێت. بۆیە سۆڤیەت کەوتە بەینەوە.

بەعس بەو تێکەوتنەی سۆڤیەت ڕازیی بوو. هەتا لە کۆتایی ١٩٦٩ دا، لە ڕاپۆرتی سیاسی بەعسدا، دان بەمافی چارەنووسی کورد، تاڕادەی یەککگرتنەوەی نەتەوایەتیشدا، نرا. بەلاّم سەرکردایەتی شۆڕشی کورد هەر لە بەعس بەدگومان بوو. ئاخرێکەی بە تین و تاوی دۆستایەتی سۆڤیەت، بەڕێکەوتن ڕازیی بوو. لەگەڵ ڕژێمدا ڕێککەوت و هیچ گوێیەکی بە گوشار و دادی ئێران و هێزە ڕۆژئاواییەکان نەدا و پشتی تێکردن و ڕووی لە سۆڤیەت کرد.

هەر پاش مانگێك لە ڕێکەوتنەکە، کێشە لەنێوان شۆڕش و ڕژێمدا سەریهەلّدا. ئەوەبوو دەزگەی جاسووسیی عێراق، هەوڵێکی سەرنەکەوتووی بۆ کوشتنی بارزانی دا. مەسەلەی سنوورەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، یەکێك لەکێشەسەرەکییەکان بوو. ڕژێم بۆ ئەو مەبەستە سیاسەتی ڕاگوێزان و بەعارەبکردنی وەبەرگرت.

شۆڕشی کورد یەکە کۆسپی سەر ڕێگەی دەستەلاتی بەعس بوو، بۆیە هەوڵیدا بەهەر نرخێك بێت ئەو کۆسپە هەڵکەنێت، ئەویش بەدەستبەرهەڵداکردنی سۆڤیەت و پارتی کۆمۆنیست لە شۆڕشەکە و وەتاق خستنی. یەکسەر پاش ڕێکەوتنەکەی ئازار، پەیوەندیی عێراق و شوورەوی لەهەموو ڕوویەکەوە بەتینتر کرا. کۆمەڵێك پەیمان و ڕێکەوتننامەی ئابووری و سوپایی و بازرگانی لەگەڵ شوورەوی و وولاتانی سۆسیالیست مۆرکران. گرینگترینی ئەو پەیمانانە، پەیمانی ئالیکاری و دۆستایەتی هەردوو وولات بوو، کە لە ئاوریلی ١٩٧٢ دا مۆرکرا. ئەمە پاش لەدەستدانی میسر، دەستکەوتێکی مەزن بوو بۆ سۆڤیەت.

بە تێکەوتنی سۆڤیەت ، هەوڵی دامەزراندنی بەرەیەکی نیشتمانیی لەنێوان بەعس و کۆمۆنیست و پارت دا درا، تا پێکرا لە حوکمدا هاوبەشیی بکەن. بۆ پارت دەستی نەدا، بەلام کۆمۆنیست لەگەڵ بەعسدا ڕێککەوت.

ڕێککەوتننامەکەی ئاوریلی ١٩٧٢ ی عێراق – سۆڤیەت، نیشانەیەکی گرنگی گۆڕانی کۆرسی سیاسەتی سۆڤیەت بوو بەرامبەر ڕژێمی عێراق. چونکە تائەو کاتە هەوڵیدەدا، هاوسەنگیی لە نێوان هەردوولا (کورد و ڕژێم) دا ڕاگرێت، بەلام ئێستا ئاشکرابوو کە بۆ سۆڤیەت پەیوەندیی بەستن لەگەڵ عێراقدا لەگشت مەسەلەیەك گرنگترە و واتا و هێمایەکی زۆری هەیە".

لە پێشەکییدا گوتمان، هەندەك لەو کەسانەی نووسەرچاوی پێیانکەوتووە و ڕای وەرگرتوون و زۆرجار نایانەوێت نێویانبهێنرێت ، جێگەی باوەڕنیین، چونکە تینی کزبووی سیاسەتبازیی هەندێکیان، تەواو سکوتی نەکردووە. ئەوەتا نووسەر لێرەدا دەنووسێت: "لە سەرکردایەتی کورد دا، ساڵی ١٩٧٤ دوو ڕا و دوو

هەڵوێستی جوداواز هاتنەکایەوە، یەکێکیان کەسانی وەك سامی ئەوڕەحمان و دارا تۆفیق بوون، کە پێیانوابوو بەتێکەوتنی سۆڤیەت ڕەنگ هەیە بتوانرێت خۆ لەبەرەنگاربوونەوەی چەکدارانە ببوێردرێت. ئەوی دیکەیان کەسانی وەکو دوکتۆر مەحمود عوسمان و حەبیب محەمەد کەریم بوون، کە پێیانوابوو تەنها بە خۆبەستنەوە بە ئەمریکا و دۆستانییەوە لەناوچەکەدا (ئێران – ئیسرائیل)، دەتوانرێت جەنگی بەرەنگارکاری لەگەڵ بەغدادا ببرێتەوە".

ژمارەی پەراوێزی ئەم پەرەگرافە (١٢٣)یە کەلە ل٣١٥ دا دەنووسێت: "لەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە کە لە فێبریوەری ١٩٨٤ دا چاوپێکەوتنی لەگەڵ سازدراوە".

هەمان لاپەڕە، یانی ل٣١٥، لەپاڵ پەراوێزێکی دیکەدا کە ١١٦ یە، دەنووسێت: "چاوپێکەوتنێك لەگەڵ مەحمود محەمەد عەبدولڕەحمان (سامی) دا، لەندەن، فێبریوەری ١٩٨٤".

گەر سەیری پەراوێزەکانی دیکە بکەین، دەبینین نووسەر لە فێبریوەری ١٩٨٤ دا، لە لەندەن چاوی بەدووکەس کەوتووە. یەکێکیان کاك سامییە لە ٨ ی فێبریوەردا. ئەوی دی کاك برایم ئەحمەدە، لە ١٠ ی فێبریوەری هەمان ساڵدا. بڕوانە پەراوێزەکانی ژمارە ٧٣ و٧٦ ی ل ٢٧٠.

گەر بزانین کاك برایم ئەحمەد بەهۆی ئەوەوە ئەودەمە لە جیهانی سیاسیدا نابووت و کەنارکەوتە بووبوو و یاخود بەڕەسمیی سیاسەتی نەدەکرد و هیچ کایەیەکی سیاسی نەدەگێڕا، لە ناویردان نیمچە دەستبەسەر بوو، ئەوا ئەوکاتە هەر دەمێنێتەوە کاك سامی کە خاوەنی ئەو بانگاشەیە بێت. چونکە هەم ئەو

کاتـه لەسـەرکردایەتی بزووتنەوەکـەدا بـوو و لەنێزیکـەوە ئاگـاداری بـارو دۆخەکـەبوو، هـەم ڕۆڵـی سیاسـییانەی ئەمرۆشـی پێویـستی بـە بۆیـاخێکی پێشکەوتنخوازانەی تۆخی لەو بابەتەیە.

جارێ با وادابنێین کە سەد دەرسەد ڕاست دەکات و ئەوخاوەنی ئەو ڕایە بووە و بەتوندیی دژی خۆبەستنەوە بە ئەمریکا و دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی وەکو ئیسرائیل و ئێرانەوە بووە. با واشدابنێین کە قەت و قەت نەچۆتە ئیسرائیل و لـە ئۆرشـەلیمەوە کـارتی بـۆ هـەڤالانی ئـەورووپای نـەناردووە. بـا واشـدانێین کـە هیـچکات خواجـە (ئەشـەربـن ناتـان) ی نـەدیتووە و نایناسـێت. بـا لـەو پرسیارەش گەڕێین گەرڕاستدەکات ، بۆچ لـەم ڕوونکردنەوەیەیاندا نەیویستووە نێوی بهێنن و ئاشکرایکەن؟ یاخود بۆئەوەبووە کە کەس نەزانێت وا هەمدیسان ئـەوە، دەسـتی چـەوری خـۆی بەسـەری بـەلارەوەگرتووی کۆنـە هەڤاڵـەکانی دەسرێت. با لەوانە گشتیان گەڕێین و هەرلەبەرڕۆشنایی ڕاکانی خۆیدا، بزانین وەکـو سیاسـەتبازێك چـەندە لـەوڕایانەیـدا ڕاسـتیی پێکـاوە و سـەرکەوتووو ڕاستگۆبووە و چەندە لەبەرژەوەندیی کورد بوون؟

لە ل ٢١١ دا دەنووسێت: "لەمارتی ١٩٧١ دا، سامی ئەوڕەحمان و دارا تۆفیق چوونە مۆسکۆ و لەگەڵ لێپرسراوانی سۆڤیەتدا کێشە و گرفتەکانی نێوان پارتی دیمـۆکرات و ڕژێمـی عێراقیـان پێشچاوخـست. لـەو گفتوگۆیانـەدا و لەهەنـدێ بواری دیکەدا، سۆڤیەت هەوڵیدەدا گوشاربخاتە سەرکورد، کە هەمیشە گلەیی و گـازندەیان لـە پاشـگەزبوونەوەی ڕژێمـی بەغدا هەبوو، کەنابێـت بـەهیچ جۆرێك لەڕێکەوتنەکەیان لەگەڵ ڕژێمی بەغدادا پەشیمان ببنەوە".

(پەراوێزی ژمارە ١١٧، چاوپێکەوتنی نووسەر لەگەڵ کاك سامی ئەورەحماندا).

پاشان نووسەر لەسەری دەڕوات و دەڵێت: "کاتێك کۆسیجین هاتە بەغدا، گوتوبێژی لەگەڵ وەفدێکی پارتی دیمۆکراتدا کرد، کە سامی ئەورەحمان سەرۆکایەتی دەکرد. باس و خواسی سەرەکیی ئەم گفتوگۆیە کە هیچ کات ئاشکرا نەکرا، هەمدیسان گلەیی و گازندەی کورد بوو لە ڕژێم و دڵەڕاوکە و ترسیان لەوەی کە ڕێکەوتنی سۆڤیەت - بەغدا لەسەر حسێبی مەسەلەکەی ئەوان تەواوبێت.

سامی ئەورەحمان، کۆمەڵێك بەڵگە و نیشانەی پەنجەژمێرکرد، کە پاشگەزبوونەوەی ڕژێمیان بەدەردەخست لە جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەی ١٩٧٠، لەوانە دەستکێشانە گیانی بارزانی.

کۆسیجین هەوڵیدا بایەخ و گرنگیی پەیوەندیی عێراق- سۆڤیەت، بۆ خودی سۆڤیەت و بۆ خەباتی گشت گەلانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و نێزیك لەدژی ئیمپریالیزم، ڕوونکاتەوە. کوردی بەهۆشهێنایەوە کە نەکەن شەڕ دەستپێبکەنەوە، سۆڤیەت هەوڵدەدات ئەو کۆسپانە لەسەرەڕێی کورد و ڕژێمدا هەڵتەکێنێت. بەلام دژی ئەو لایەنەش دەوەستێتەوە، کە شەڕ هەڵگیرسێنێتەوە".

(چاوپێکەوتنی نووسەر لەگەڵ سامی ئەورەحماندا)

نووسەر لەسەری دەڕوات و دەڵێت: "پاش ئیمزاکردنی پەیمانی هاریکاریی سۆڤیەت و عێراق، ڕژێمی عێراق هەڵوێستێکی هێجگار ڕەقی بەرامبەر کورد وەبەرگرت و شووڵی لێهەڵکێشا و بارەکەی تەواو شێواند".

پاشان دەنووسێت:

"کە بۆریس پۆنۆماریفی سکرتێری یەکەمی کۆمیتەی نێوەندیی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت هاتە بەغدا، تا بکەوێتە نێوان کورد و ڕژێمەوە، ویستی سەردانی بارزانی بکات، بەلاّم ڕژێم ڕێگەی نەدا. لەبەغدا چاوی بە سامی ئەوڕەحمان و دارا تۆفیق کەوت. لەو گفتوگۆیانەدا دانی بەوەدا نا، کە ئەو مافی ئۆتۆنۆمییەی ڕژێم بلاّویکردۆتەوە، لەداواکانی کورد زۆر کەمترە. بەلاّم بارودۆخی ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست هێندەی بەبەرەوەنییە کە شوورەوی بتوانێت چاو لە دۆستایەتی عێراق بپۆشێت و زۆری لێبکات هەلّوێستی خۆی ڕاستکاتەوە".

(چاوپێکەوتنی نووسەر لەگەلّ کاك سامی ئەوڕەحمان)

(دیارە ئەمە لە کاتی گیانەلّلاّی مۆلّەتە چوارساڵانەکە بووە، یانی سالّی ١٩٧٤. هەرچەندە نووسەر ئەوەی نەنووسیوە).

کەواتە گەر بە گوتەکانی کاك سامی خۆی باوەڕبکەین دەبینین ڕەنگ هەیە هیچی لێشین نەبوو. ئەوەتا خۆی دەگێڕێتەوە کە بەشداریی سەرجەم ئەو هەولّ و کۆششانەی کردووە، کەلەگەلّ ڕژێم و سۆڤیەتدا دراوە و کراوە، بۆ بەرگرتن بەهەلّگیرساندنەوەی شەڕ.

وەك یادم بێت، پەیوەندیی و گفتوگۆ تا ناوەڕاستی مارتی ١٩٧٤ لەگەلّ ڕژێمدا نەپسا و هەربەردەوام بوو، ئیدریس بارزانی ووەفدێك تا ئەو ڕۆژانە هەر لەبەغدا خەریکی گفتوگۆبوون. بەلاّم هەمووی بێسەمەر بوو. ڕژێم دەیەویست ئەوەی لە ١٩٧٥ دا بۆی لوا و دەستیدایە هەر لە ١٩٧٤ ەوە دەستیپێبکات.

گەرەكی بوو بزووتنەوەكە بێ پەڕو باڵكات و بەدەردێكی بەرێت، ئەوەی پاشان بەسەر كۆمۆنیستی هێنا، لە چاویدا حەڵوا بێت.

ئەوجا با بە تەرازووی سیاسەت ، ئەو ڕووداوانەی كاك سامی خۆی دەیانگێڕێتەوە هەڵیانسەنگێنین و پاشان هەرخۆشی بكەینە دادوەر، تا بزانین داخۆ ئەو هەڵوێستەی كە گوایە ئەو هەیبووە، ڕاست بووە و پڕاوپڕ لە بەرژەوەندیی كورد بووە؟ یاخود بۆ فرۆختنی ڕۆژی ئەمڕۆیە و گەر بوو بێتیش لە هەڵوێستی دووهەم چێتر نەبووە؟

بەرلە هەرشت دەبێت ئەوە بڵێین كە هەڵوێستی یەكەم پێش دووهەم بەلاداهات و گیانی سپارد. چونكە ئەوەتا وەك بۆماندەگێڕێتەوە گفتوگۆ بە تێكەوتنی سۆڤیەت تا دواپلە نەپسا و هەوڵی بۆدرا. مەگەر كاك سامی بیەوێت بڵێت دەبا بزووتنەوەكەش وەك پارتی كۆمۆنیست تەسلیم با و چارەنووسی خۆی دابا دەست ویژدانی بەعس.

ئەو كاتە موعادەلەكان بەمجۆرە بوون:

١-سۆڤیەت لەبەردەم دووڕیانێكدا بوو، كە جەمسەرێكی بەبەرژەوەندییە ستراتیژییەكانییەوە بەسترابوو، بنكە و پێگەیەكی لەناوچەكەدا بۆ ڕەخسابوو، كە لە پاش سەرنگومبوونی قاسمەوە چیدی هەلی وای بۆ هەڵنەكەوتبوو. ئەو بەرژەوەندییانەی كە ساڵەهای ساڵ بوو لەپێناویدا بە داشەهارەی كورد و كۆمۆنیست كش مەلیكی لەڕژێمە یەك لە دووی یەكەكانی عێراق پێدەكرد. ئێستاكە تۆ بڵێیت لەم دەمەدەمی بەرگرتن و تەرزفرێدانەدا، بۆچۆلەكەی سەر داری كورد لەدەستی بدات وحەمامۆكەی خۆی بە پێلەقەیك تێكبداتەوە؟

دیارە مەگەر سیاسەتبازی وەك ئەو بلیمەتانەی کورد چاوەڕێی منداڵبازاڕی ئاوها لە دەوڵەتێکی کیسەڵڕەوی وەك سۆڤیەت بکەن.

٢-کورد لەبەردەم دووڕیانێکدا بوو، کە یا دەبا چۆکی بۆ بەعس دادا یا و ڕێگەی دابا هەر ئەوکاتە کوردستان بەئارەزووی گڵاوی خۆیان بکەنە عارەبستان و میللەتەکەش تۆوبڕکەن. ئەوەش تەنها لەبەرخاتری دۆستێك کە ئاشکرا کەری بەرژەوەندییەکانی خۆی بەستۆتەوە و بەنیازە کوردیش سندم کات. یاخود وەك نیمچە خنکاوی بەرشەپۆلی ڕووبارێك، دەست بۆ تووتڕك و چڵەپووشی کەنار بکێشێت، بەهیوای ئەوەی نوقم نەبێت ولەو گێژاوە بخەلەسێت.

لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە هەر لە بنەڕەتەوە دژی خۆبەستنەوە بە هێزە گەورەکانەوەین، بەتایبەت وەکو ئەوکاتەی شۆڕشی کورد بگاتە ئەو مەودایەی کە کەوشەن و سنووری ئەو پەیوەندییانە بەو شێوەیە بپسێت و سەرکردایەتییەکەی وەك فاڵچی ڕمڵ لێبدەن و بە (ڕەنگ هەیە) بیانەوێت لەبەرچوونی خوێن و ئەسرینی چواردەساڵەی ئەو میللەتە زەلیلە بێدەرەتانە ڕاگرن. بەلاّم هێشتا پێمانوایە هەڵدێران لە خۆبەدەستەوەدان شەرەفمەندانەترە.

بەردەوامیی لەسەر هەڵوێستی یەکەم، خۆبەدەستەوەدان و خۆتواندنەوەیە لەبەرژەوەندیی دۆستێکی یەکەدۆستی بەرژەوەندییەکانی خۆیدا. هەڵوێستی دووهەم، بواری مناوەرە و سەوداو مامەڵەیەك دەهێڵێتەوە. ئەمە نێزیکەی هەمان دووڕیانی دژواری دەمەدەمی کۆتایی کۆماری مەهاباد بوو. بارزانی

ئەمجارەش هەڵوێستی پێچەوانەی پێشەوای شەهیدی وەبەرگرت. خۆزیا و سەد بریا ساڵێك دواتریش ئەو ئازایەتییەی مابا.

کەواتە گەر بە شێروخەتەکەش بێت کە کاك سامی کردوویە، پێمانوایە بێدەنگیی و ڕازیبوونەکەی ڕاستربوو لەو بوختانەی بەخۆی دەکات.

کاك سامی ئەوڕۆکە بەچەند مەبەستێك ئەو بانگاشەیە دەکات:

١-وەك گوتمان ڕۆڵی سیاسەتبازیی ئەوڕۆی پێویستی بە بۆیاخێکی خەستی پێشکەوتنخوازانەی لەو بابەتەیە.

٢-هەڵوێستی دووهەم لە سەداسەد دۆڕاوە و هەرەس پەردەی ڕەشی بەسەردا داداوەتەوە. دەیەوێت بیسەلمێنێت ئەوساش هەرخاوەن هەڵوێست و دووربین بووە و وێراوێتی لەبەردەم بارزانیدا نقەبکات.

هەڵوێستی یەکەم کە گوایە خۆی خاوەنی بووە، تاسەر تاقیینەکراوەتەوە، ئەوەتا ئێستا دەتوانێت بڵێت (ڕەنگ هەیە) سەرکەوتبایە.

٣-پاش هەرەس و نائومێدی لە ئەمریکا و ئیسرائیل و ئێران، بیری مارکسیزمی سەربەسۆڤیەت، بازاڕی گەرمە. ئەمە دانڕۆکردنە و تەپکەنانەوە بۆ گەلەك هەرزەکاری سیاسی.

٤-تاوانی هەرەس و چارەنووسی تاڵی پاش هەرەسی ئەو میللەتە لەگەردنی ملۆزمە سیاسییەکانی دوێنێ وئەوڕۆی بئاڵێنێت و نابووت و ڕیسوایانکات، خۆشی نەك هەربێ ئارەق دەرچێت، بەڵکە وەك خاوەن هەڵوێستێکی ڕاست و ئازایانەش حسێبی بۆبکرێت.

بابگەڕێینەوە سەرەوکاری نووسینەکەی کاك فازڵ، کە لە ل٣٠٢ دا دەنووسێت:"لەوجەنگە خوێناوییەی نێوان مارتی ١٩٧٤ و مارتی ١٩٧٥ دا، کە نێزیکەی شێست هەزار قوربانیی خواست، کۆمەکی سوپایی سۆڤیەت بەعێراق ، کایەیەکی زۆری لەدەستنیشانکردنی چارەنووسیدا دیت. بە ئامۆژگاریی سۆڤیەت، ئۆردووی عێراق مەڵبەندە ستراتیژییە زۆرگرنگەکانی لە کورد گرت. بەپێی گوتەی کورد و هەندەك سەرچاوەی ڕۆژئاوایی، فڕۆکەوانە سۆڤیەتییەکان، فڕۆکەنوێکانی (تۆپۆلیف ٢٢) یان دەئاژووو کوردستانیان بۆردومان دەکرد.

بۆ پشتگیریی ئەم ڕوونکردنەوانەی کاك فازڵ، بەپێویستی دەزانم هەندەك زانیاریی دیکەیان بخەمەسەر:

فڕۆکەوانی عێراقی (صفاء شلال)، کە فڕۆکە مێکە ١٩ کەی لە ٣ ی ئۆگوستی ١٩٧٤ دا لە دۆڵی باڵەك خرایە خوارەوە و خۆی دەستگیرکرا، دانی بەوەدا نابوو کە فڕۆکەوانە سۆڤیەتییەکان فڕۆکە تۆپۆلیفەکان دەئاژوون، چونکە ئەوفڕۆکانە ئەوکاتە نوێبوون و هیچ فڕۆکەوانێکی عێراقی مەشقیان لەسەریان تەواو نەکردبوو. هەروها ئەوەشی ئاشکرا کردبوو کە نێزیکەی ٣٠٠٠ ڕاوێژکاری سوپایی سۆڤیەت لە عێراقدان. (٤٤)

کاك فازڵ خۆشی لە جێگەیەکی دیدا، لە ل٩١ دا نووسیویە کە تا ١٩٧٨ نێزیکەی شازدە هەزار سەربازی سۆڤیەتی لەعێراقدا بوون.

دیارە ئەمانە بۆ ئەوە دانەبەستراون مێش بقەپێنن، دەبێت بایی ئەو دۆلارە زۆرەی وەریانگرتووە، خزمەتی بەعسیان کردبێت!

لەهێرشەکەی ئۆردووی عێراقدا، کە لە قۆڵی کۆرەك و بێخاڵەوە هێرشیان بۆ ڕەواندز کرد، سەرهەنگ (ئەلێکساندەر ڤازیلیف) سەرپەرشتیی ئەو هێرشەی دەکرد. (٤٥)

ساڵی ١٩٧٦، کاتێك هێشتا لەووڵات بووم، گۆڤارێکی نهێنی هێزی زرێپۆشی عێراق کە نێوی (مجلە الدروع) بوو، کەوتە دەست ڕێکخراوێکی سیاسی، منیش بەخت یاریبوو ئەو گۆڤارەم خوێندەوە، بەداخەوە ئێستا ژمارەکەییم لەیاد نەماوە. بەهەرحاڵ گوتارێکی تێدابوو کەیەکێك لە ئەفسەرە بەشدارەکانی هێرشەکەی ڕەواندز لەژێر سەردێڕی (دبابات البعث تتحطم اسطورة کورك)دا نووسیبووی. زۆر بەووردی باسی هێرشەکەی تۆمار کردبوو. ئەوەی لەیادم ماوە ئابەمجۆرە بوو: "پاشئەوەی هێزەکانمان لە گەلی عەلی بەگ دا لەلایەن هێزەکانی (جیب العمیل) ەوە ئابلوقە درابوون و پەیوەندییمان لەگەڵیاندا پسابوو، ناچاربووین بەدوای چارەسەرێکی خێرادا بگەڕێین. ڕاوێژمان بە ووڵاتێکی دۆست کرد. ئەوان بە مانگی دەستکرد، وێنەی ناوچەکەیان بۆگرتین و نەخشەیان بۆ کێشاین. ڕێگەیان بۆ دانایین چۆن چۆنی بێئەوەی پێویستمان بە گەلی هەبێت، بگەینە حەوزی ڕەواندز. نەخشەکە لە بێخاڵەوە دەستیپێدەکرد. بەلاّم هیچ ڕێگەیەك نییە لەو کێوانەوە بگاتە ئەوێ. ناچار گوێزانی بلدۆزەرمان لە زرێپۆشەکانمان بەست و بەدەم تەقە و شەڕەوە ملمان نا. ڕۆژی واهەبوو لە چەند مەترێك زێتر بڕمان نەدەکرد. چونکە یاخیبووە تاوانکارەکان، کەوکوژی بە قەناصەکانیان تێماندەکەوتن. هیچ سەربازێك نەیدەتوانی بۆ چرکەیەك

سەردەربهێنێت...". بەهەرحاڵ بەشێوازێکی زۆر بەتام و چێژ وسەرنجڕاکێش، باسی چۆنیەتی گیشتنە ڕەواندزیانی تۆمار کردبوو.

ئاشکرایە ئەو وولاتە دۆستەی بەمانگی دەستکرد وێنەی ناوچەکەی بۆ گرتوون و نەخشەی بۆ کێشاون، (سۆڤیەت) ی قەلاّی قایمی گەلان و پشت و پەنای میللەتانی چەوساوە و زۆرلێکراوی جیهان بووە!

ئەمە پاداشتی ئەو هەلّوێستە دۆستانەیەی کورد بوو کە بارزانی پاش سەردانەکەی ڕۆژهەلاّتناسی سۆڤیەتی (پیرماکۆف) ، بە باوەڕپێکراوانی خۆی ڕاگەیاند: "گەر دۆستایەتی و بەرژەوەندیی هاوبەشی سۆڤیەت و کورد نەبا ، هیچکات ئامادەنەبوو لەگەلّ بەعسدا گفتوگۆ بکات".

پیرماکۆف لەو سەردانەیدا کە دووبەدوو لەگەلّ بارزانیدا بە ڕووسی دەدوان، بارزانی ڕازیکرد کە گفتوگۆ لەگەلّ بەعسدا بکات وسەرئەنجامەکەی ڕێکەوتننامەی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ بوو. بەلاّم کە بەرژەوەندییە تاک لایەنەکانی سۆڤیەت چەسپا، دۆستایەتی و بەرژەوەندیی هاوبەشیان ژێرپێ نا.

بە پێویستی دەزانم دوو هەلّەی چکۆلەش ڕاستکەمەوە کەبەسەر کاک فازلّ دا تێپەڕبوون:

لەلاپەڕە ٢٨٣ دا دەنووسێت: "تالّەبانی لە ١٩٦٣ دا، پێش گەڕانەوەی لە ئەورووپاوە بۆ کوردستان، بەدزییەوە سەردانێکی مۆسکۆی کرد. لەگەلّ کاربەدەستانی سۆڤیەتدا، باسی کۆمەك و پشتگیریی کورد کرا لەپاشەڕۆژدا".

پەراوێزی ژمارە ٤٤ کە لە ل ٣١٢ دا ڕوونیدەکاتەوە، دەنووسێت: "ڕادوێی مۆسکۆ لە ٢٨ ی ژوونی ١٩٦٣ دا، دەقی گفتوگۆ و چاوپێکەوتنێکی لەگەلّ

تاڵەبانیدا پەخشکرد). لێرەدا خوێنەربۆی هەیە بپرسێت: ئیدی ئەوە چۆن نهێنییەك بووە، کە ڕادوێی مۆسکۆ ئاشکرای کردبێت؟

لەهەمان لاپەڕەی ٢٨٣ دا، دەنووسێت: "لەو سەردانەی تاڵەبانیدا، سۆڤیەت پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە پێویستە برایم ئەحمەدی سەرۆکی پارتی دێموکراتی کوردستان، سەردانێکی سۆڤیەت بکات".

دەبا نووسیبای "یەکێك لەسەرکردەکانی پارتی دێموکراتی کوردستان"، یاخود "سکرتێری گشتیی پارتی دێموکراتی کوردستان"، چونکە برایم ئەحمەد سەرۆك نەبووە.

"پەیوەندییەکانی زلهێزێکی وەك سۆڤیەت و میللەتێکی زۆرلێکراوی وەکو کورد، بەشێوە و شێوازێکی هێجگار ئالۆزو جۆرا و جۆر تەونکراون. تا تەواو تەواوو پڕاوپڕ لەچۆنیەتی ئەو پەیوەندییانە بگەین، هێندە بەس نییە کە تەنها پەیوەندیی چەند لایەنێکی کوردی و هەڵوێستی ڕەسمیی سۆڤیەت هەڵشێلین و شیکەینەوە، بەڵکە وا پێویستە لە تەك ئەوانەشدا، تان وپۆی داوە پەیوەندییە هاوتەریبەکانی دیکەش بتوێژینەوە.

یەکێك لە جەمسەرەکانی ڕایەڵی ئەو پەیوەندییانە، وولاتانی سۆسیالیستن، کە گەلەکجار پاشکۆی سیاسەت و خواستی سۆڤیەت ڕەنگپێدەدەنەوە و پشتگیریکەری ئەو هەڵوێستانەن. لە شێستەکانەوە تین و تاوی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا لەسەرهەڵدان و گەشەکردندایە. لەو کاتەوە وولاتانی هاویەیمانی سۆڤیەت، هەمان هەڵوێستی سۆڤیەتیان بەرامبەر کورد وەبەرگرتووە.

یەکێك لەئامرازەکانی دی، ڕۆڵی پارتە کۆمۆنیستەکانی ناوچەکە و ئەو وولاتانەن کە پشتگیریی ئامانج و سیاسەتی سۆڤیەت دەکەن. سەرەڕای ئەوەش هەڵسەنگاندن و نرخاندنی ئەو پارتە کۆمۆنیستانە وەکو داردەست و قەرەقۆزێکی دەستی سۆڤیەت، یەك لایەنە و هەڵەیە، چونکە پارتە کۆمۆنیستەکان زۆرجار بەرژەوەندییە ناوچەییەکان ڕەچاودەکەن و هەندە جارێکیش گێرمە و کێشەی ئیدیۆلۆژیی لەسەر مەسەلەی نیشتمانیی و کەمەنەتەوەییەکان هەڵدەستێنن.

وولاتە سۆسیالیستەکانی وابەستەی سۆڤیەت، هەمیشە ئاوێنەی بالانمای سیاسەتی ڕەنگڕێژراوی سۆڤیەتن لەجیهاندا. سیاسەت و هەڵوێستیان

بەرامبەر بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد، لەو ڕێچکەیە نەترازاوە و هەردەم نوێنەر و دیوی دووهەمی ئەو سیاسەتە بوون.

باشترین نموونە، هەڵوێستیان بووە لە ئاست ڕووداوەکانی ١٩٦٣ ی کوردستاندا. ئەو دەمە سۆڤیەت مەسەلەکەی لا مەبەست بوو، بۆیە نەهات ڕاستەوخۆ خۆلە مەسەلەکە هەڵقورتێنێت، بەڵکە وولاتێکی وەك مەنگۆلیای ڕاسپارد ئەو ئەرکە وەئەستۆگرێت. تا بەو هۆیەوە داوی پەیوەندیی دیپلۆماسییانەی خۆی لەگەڵ عێراقدا نەپسێت.

لە ناردنی کۆمەك و یارمەتیدا، وولاتانی دیکەی سۆسیالیستیش جمێندران. لەپاڵ خاچی سووری سۆڤیەتدا، خاچی سووری هەنگاریا و بولگاریا و ئاڵەمانیای خۆرهەلاتیش وەخۆ کەوتن.

نموونەیەکی دیکەی لەوجۆرانە، مەسەلەی زەمالە و کورسی خوێندن و پەروەردە و مەشقکردنە. خوێندنی کوردەوانی لەسۆڤیەت و تەکنیك و زانستەکانی دی لەوولاتانی سۆسیالیست، بۆ خوێندکارانی کورد فەراهەم کرا. گەلەك لەڕێبەرانی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد، خوێندنی خۆیان لە ئاڵەمانیای ڕۆژهەلات و چیکۆسلۆڤاکیا، تەواو کردووە.

مەسەلەی ئاڕاستە و پڕوپاگەندە و ڕاگەیاندن، خاڵێکی دیکەی هاوبەشی ئەو هەڵوێستە یەکخراوانەیە. وولاتانی سۆسیالیست شوێنی پێکگەیشتنی نهێنی نوێنەرانی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد و کاربەدەستانی سۆڤیەتیی بەرپرسیاری ئەو ئەرکانە بوون، بەتایبەت چیکۆسلۆڤاکیا و ئاڵەمانیای ڕۆژهەلات و بولگاریا. بەرلینی خۆرهەلات، هەمیشە وێستگە و بەردەبازی

نوێنەرانی کوردی داوەتکراوی سۆڤیەت بووە. لەوێ پاسپۆرتی پێویستی ئەو سەردانانەیان بۆ ئامادەدەکرا. ئەوجا بەدزییەوە بەرەو سۆڤیەت بەڕێدەخران.

لەو سالأنەی دواییدا، سۆڤیەت هەندەك وولأتانی دیکەی هاوپەیمانی ناسۆسیالیستی لە ڕۆژهەلأتی نێوەڕاستدا پەیداکرد، کە هەمان ئەرکیان دەبینی، بەتایبەت لیبیا و سوریا کە گەلەکجار هەلٌوێستی سۆڤیەت بەرامبەر مەسەلەی کورد ڕەنگپێدەدەنەوە. هەرچەندە ناتوانرێت ئەمە تەنها بەتین و تاوی سیاسەتی شوورەوی لێکبدرێتەوە، بەلٌکە دەبێت کێشە و بەرژەوەندیی دیکەش تێبخوێندرێتەوە.

بزووتنەوە ئازادیخوازەکانی دیکەش، تایبەت بزووتنەوەی ئازادیخوازی فەلەستین، هەمان سیاسەتی سۆڤیەت بەرامبەر بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد وەبەردەگرن. لەڕووی سوپایی و ماددییەوە، کۆمەکێکی بەرچاو بە بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد دەکەن. بەپلەی یەکەم (بەرەی دیمۆکراتی ئازادیخوازی فەلەستین)، پڕاوپڕ هەلٌوێستی سۆڤیەت ڕەنگپێدەدەنەوە. ئەم پەیوەندیی و هاوکارییانە، بیرو ڕێبازی سەر بە سۆڤیەتیان لەبزووتنەوەی کورددا برەوپێداوە. بەتایبەت لە عێراق و تورکیادا ئەو دیاردەیە بەزەقی بەدەردەکەوێت.

پارتە کۆمۆنیستەکانی وولأتانی ڕۆژهەلأتی نێوەڕاست، هەرچەندە هەمیشە چالاك بوون، بەلأم لە ڕێڕەوی سیاسییانەی ئەو وولأتانەدا، کایەیەکی بنبڕیان نەگێڕاوە.

بەهۆی وابەستەیی ئەو وولأتە تازە دامەزراوانەی پاش یەکەم جەنگی جیهانی بەبەرەی ڕۆژئاواوە، پێگەیەکی چاك بۆ پارتە کۆمۆنیستەکان ڕەخسا.

ئەمانە هەر لەسەرەتاوە، تاکە ئامرازی دەستی شوورەوی بوون لە ناوچەکەدا، پارێزەری بەرژەوەندییەکانی بوون. ئەو هەڵوێستانە بە یەکێك لە ئەرك و پێویستییەکانی خەباتی ئینتەرناسیۆنالانە دادەنرا، کە سۆڤیەت بە چەق و کرۆکەکەی دەزانرا.

لێرەدا دەتوانین هەڵوێستی پارتی کۆمۆنیستی عێراق وەك نموونەیەکی ئەو پارتە کۆمۆنیستانە، هەڵسەنگێنین:

پارتی کۆمۆنیستی عێراق کە لە مارتی ١٩٣٤ دا، لە یەکگرتنی چەند گروپێکی جوداوازی گچکەگچکە، بە کۆمەکی کۆمێنتێرن دامەزرا، هەر لەسەرەتاوە مەیلی زۆری بەلای کێشەی کەمەنەتەوەییەکاندا نیشاندا. مەسەلەی کورد کە لە نێوان دوو جەنگە جیهانییەکەدا لە نەخشەی سیاسەتی شوورەوی و کۆمێنتێرن دا هیچ نرخ و بایەخێکی بۆ دانەنرابوو، لەبەرئەوە پارتی کۆمۆنیستی عێراقیش بایەخی پێنەدەدا. لەگەڵ ئەوەشدا مافی چارەنووسی کورد بەلای ئەوانەوە مەسەلەیەکی بێ چەند و چوون بوو، لە پرۆگرامی حیزبەکەشیاندا دانیان پێدانابوو.

کێشەی نەتەوەکان لە سیاسەتی پارتی کۆمۆنیستی عێراق و پارتە کۆمۆنیستەکانی دیکەی رۆژهەڵاتدا، مەسەلەیەکی لەبار و گونجاو بوو بۆ پڕوپاگەنتە و بانگاشەی هەمیشەیان. پیاوانی کەمەنەتەوەیی و ئاینییەکان، رۆڵێکی دیاریان لە رێڕەوی کۆمۆنیستانەی ناوچەکەدا دیتووە. ئەو دەورەیان هەمیشە لە قەوارەی راستەقینەی خۆیان قەبەتر و باڵاتر بووە. ئەمەش بەسوود و دەستکەوتی پارتە کۆمۆنیستەکان شکاوەتەوە. لەو پەنجا ساڵەی دواییدا، جگەلە ساڵانی ١٩٥٥-١٩٦٣، کە شیعەیەکی عارەب (سەلام عادل) بووە سکرتێری

گشتیی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، ئیدی سەرپاکی ئەوانی دی، یا جوو بوون، یا کورد، یا فەلە. ١٩٣٤-١٩٤٩ یوسف سەلمان فەهد (فەلە)، ١٩٤٩-١٩٥٠ یەهودا صدیق (جوو)، ١٩٥٠-١٩٥١ ساسۆن شلەمۆ دەلال (جوو)، ١٩٥١-١٩٥٤ بەهادین نوری (کورد)، ١٩٥٤ حەمید عوسمان (کورد)، ١٩٥٥-١٩٦٣ سەلام عادل (عارەب)، ١٩٦٤ تا ئێستا عەزیز محەمەد (کورد).

هەر لەسەرەتاوە پارتی کۆمۆنیستی عێراق، لقێکی کوردستانی و لقێکی ئەرمەنیی هەبوو. هەرچەندە ئەرمەنییەکان لە عێراقدا، لەچاو تورکمان و کلدان و ئاسووری و جوولەکەدا، کەمەنەتەوەییەکی هێجگار گچکە و کەم بوون. ئەمەش هەمدیسان ڕەدووکەوتنی بەرژەوەندیی و مەیل و ئارەزووی سیاسەتی سۆڤیەت نیشاندەداتەوە.

لە دوای نێوەڕاستی سییەکانەوە، لەبەر ئەوەی ڕژێمی عێراق، پابەندی سیاسەتی ئینگلتەرەی دژبەسۆڤیەت بوو، بەوهۆیەوە دژایەتی بەریتانیا و هەوڵدان بۆ باشترکردنی سیاسەتی عێراق بەرامبەر شوورەوی، دیارترین کرۆك و جەوهەری سیاسەت و پرۆپاگانتەی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوو.

گرنگترین خاڵە سەرەکییەکانی پرۆگرامی پارتی کۆمۆنیست، کە لە سەرگوتاری ڕۆژنامە نهێنییەکانیدا، لەلایەن فەهدەوە بلاودەکرایەوە ئەمانە بوون:

١-خەبات لەپێناوی ڕزگارکردنی عێراق لە دەستەلاتی بەریتانیا و هێزە ڕۆژئاواییەکانی دی.

٢-خەباتی چینایەتی، کە بەواتای داکۆکیکردن لەماف و بەرژەوەندییەکانی چینی کرێکاران وجوتکاران دێت، کە لەژێر جەوروستەمی هێزە مۆنۆپۆل و فیۆدالەکاندا دەناڵن. هەروەها پارێزگاریکردن لە مافی کەمەنەتەوەییەکان کە هەموویان لەژێر جەوری ڕژێمی وابەستە بە دەستەلاتە داگیرکەرەکاندا دەچەوسێنەوە.

٣-خەبات لەپێناوی هەڵتەکاندنی پاشماوەی دەستەلاتی کۆلۆنیالی لەسوریا ولوبنان و میسر و هەموو ئەوولاتانەی ڕۆژهەلات کە لەلایەن ڕۆژئاواوە دەستیانبەسەردا گیراوە.

٤-خەبات بۆ هاریکاریی و ڕایەڵکردنی داوی پەیوەندیی سیاسی و کولتوری و ئابووریی و بەستنی پەیوەندیی دیبلۆماسی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا.

بەهۆی دووهەم جەنگی جیهانییەوە بارە سیاسییەکە شێوا. شوورەوی لەدژی ئاڵەمانیای نازیی، لەگەڵ هێزە ڕۆژئاواییەکاندا یەککەوت. هێزەکانی شوورەوی وئینگلیز چوونە ئێرانەوە وداگیریانکرد. لەسەرتاسەری جیهاندا، هێزە کۆمۆنیست و دێموکراسییەکان دژی نازیی یەکیانگرت.

ئەوگۆڕان ووەرچەرخانە لە سیاسەتی سۆڤیەتدا، لە سیاسەتی پارتی کۆمۆنیستی عێراقیشدا ڕەنگیدایەوە وئاوهای لێهات:

١-ئامادەیی تەواو بۆ هاریکاریی لەگەڵ ڕژێمدا دەردەبڕین، لەپێناوی بەرگرتن بەخەتەری نازیی لەعێراقدا.

٢-هەوڵی هێنانەدی هەلودەرفەتی هاریکاریی نێوان عێراق وشوورەوی دەدەین.

٣-هەوڵی ئەوە دەدەین کە ڕژێم ئازادیی کارو چالاکی پارتی کۆمۆنیست دەستەبەربکات، وەکو لە هەندێك وولاتانی ڕۆژئاوا و وولاتانی سەربەو بەرەیەدا هاتۆتە ئاراوە.

لەسەردەمی کۆماری مەهاباددا، بەپێی تاکتیکی نوێی سۆڤیەت بەرامبەربە مەسەلەی میللەتان، پارتی کۆمۆنیستی عێراقیش داوای لە نیشتمانپەروەرانی کورد دەکرد، پارتێکی ناسیۆنالیست کورد دابمەزرێنن.

دوای خنکاندنی فەهد و هاوڕێکانی، پاش زۆربۆهێنان و ڕەدوونان و دووبەرەکیی زۆرانبازییەکی زۆری نێو ڕیزەکانی پارتی کۆمۆنیست، مەیلی پارتەکە و بانگاشەی پشتگیریکردنی مەسەلەی کورد خاو و کاڵبووەوە. هەتا لەسەرەتای پەنجاکاندا پەیوەندییە ئینتەرناسیۆنالیستانەکەشی بۆماوەیك پسا.

لە ١٩٥٠ دا، سەلام عادل توانی ڕیزەکانی حیزب یەکخاتەوە و پەیوەندییە ئینتەرناسیۆنالیستەکەش گرێبداتەوە. لە کۆنگرەی ١٩٥٦ دا، پرۆگرامێکی نوێ بۆ حیزبەکە داڕێژرا، کە تاڕادەیەك ڕێبازو ڕێڕەوێکی چەسپاوی بۆ حیزب ڕەنگرێژ کرد. (٤٦)

هاوکات ڕاستەوخۆ لەژێرتین و تاوی ڕێڕەوی سیاسەتی سۆڤیەتدا بوو. ڕێبازی سەرەکیی حیزبەکە، ئاشکرا لەبەر ڕۆشنایی و بەکاریگەرێتی گوتەکەی خرۆشۆف دا بیراز کرابوو، کە لە بیستهەمین کۆنگرەی پارتی کۆمۆنیستی شوورەویدا خوێندییەوە. بۆیە سەرەڕای ئەو گوشار و زەبر و زۆرەی ڕژێمی عێراق خستییە سەر پارتی کۆمۆنیست، کەچی حیزب هەڵوێستێکی هێورانە و

ئاشتییانەی بەرامبەر ڕژێم وەرگرت. لە بلاوکراوەیەکی ١٩٥٧ ی حیزبدا، گوتەکەی ١٩٥٦ ی خرۆشۆف بە ڕێبازێکی نوێی ژیرانە و ڕاستیپەرستانە هەڵدەسەنگێندرێت. نوێنەری پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە ٢٢ هەمین کۆنگرەی پارتی کۆمۆنیستی شوورەویدا، ساڵی ١٩٦١ ، پێی لەو ڕاستییە نا و ئاشکرای کرد کە پارتەکەی لەکۆنگرەی ١٩٥٦ یدا، لەژێرتین و تاوی بڕیارەکانی بیستهەمین کۆنگرەی پارتی کۆمۆنیستی شوورەویدا هەڵسووڕاوە و بەو ئاقارە هەنگاوی هەڵناوە. هەربەو پێیە ڕێبازی خۆی ڕاستکردەوە و لەخەباتیدا ڕێڕەوێکی ئاشتیخوازانە و هێمنانەی گرتەبەر.

پاش ١٩٥٧ و تایبەت پاش کودەتاکەی تەموزی ١٩٥٨، چەند باڵ و بیر و بۆچوونێکی جوداواز لە ڕیزەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقدا چەکەرەیان کرد. لەگەڵ هەموو بەریەرچ و هەڵبەزینەوەیەکی باڵەکانی دیکەدا، ئاکام باڵی سەر بە شوورەوی، توانی جۆگەی سیاسەتی گشتیی حیزب بڕژێنێتە نێو گۆمی بەرژەوەندییەکانی شوورەوییەوە و بەو ئاقارەیدا بەرێت.

لەگەڵ ئەوەدا کە هەوەسی دیکتاتۆرێتی قاسم بەردەوام لە هەڵچوون و پەرەگرتندا بوو، کەچی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، هەتا سەرنگومبوونی ڕژێمەکەش، بێ چەند و چوون پشتی گرت، سەرەڕای ئەو بەرەنگاربوونەوە خوێناوییەی ڕژێم و ئەو ستەمە زۆرەی لەکوردی دەکرد، چونکە ئەوان سیاسەتی دەرەکیی قاسمیان بەلاوە گرنگبوو، گوایە قاسم سیاسەتێکی دژبە ئیمپریالیزمی وەبەرگرتووە. بۆیە لەگەڵ هەندە بۆرە ڕەخنەیەکیشدا، تانەمانی، بە پاڵپشتی مانەوە.

شوورەوی و پارتە کۆمۆنیستەکانی ڕەدووکەوتووی سیاسەتی، هەتا سەرەتای شێستەکانیش، هەڵوێستێکی دردۆنگ و گوماناویان بەرامبەر نەتەوەییە عارەبەکان هەبوو. تایبەت بەرامبەر دووباڵە گەورەکەی ناصر و بەعس. لەگەڵ پەیدابوونی جێپێیەك بۆ سۆڤیەت و خۆخزاندنە ناوچەکەوە، پارتە کۆمۆنیستە وابەستەکانی، تەقلەیان بەهەڵوێستیان لێدا و نەك تەنها بەهاوکاریی ئەو حیزبە نەتەوەییانە، بەڵکە بە ڕێبەرایەتی هەندێکیشیان ڕازیبوون و خایە و مایەیان لەگەڵ تێکەڵکردن. ئەو هەڵوێستە چەرخ و فەلەکییانەیە، کە پێچەوانەی سیاسەتی کلاسیکیانەی وەبەرگرتووی پێش ئەو سەردەمەیان بوو، ژمارەیەکی زۆر دووبەرەکی و لێکترازانی لەڕیزەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق و کۆمۆنیستانی ناوچەکەدا خوڵقاند. هەرچەندە مەسەلەی ئازادیی میللەتان و کەمەنەتەوەییەکان و مافی کولتووریی گەلی کورد، بنێشتەخۆشەی ژێر دانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوو، بەلاّم پەیوەندیی نێوان پارتی کۆمۆنیستی عێراق و بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد، بێ سەرئێشە و گرفت نەبوو. مەسەلەش ململانێ و کێشمەکێش بوو لەسەر مەسەلەی پێشڕەوایەتی لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا. شوورەوی گەلەکجار ئامۆژگاریی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی دەکرد، کە ئاسۆی بیری فراوانتر بێت و هاوکاریی و هاریکاریی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد بکەن. هانیدەدان بەرەیەکی نیشتمانیی بسازێنن، تا لەو ڕێگەیەوە تین و تاو و کاریگەرێتی شوورەوی لەسەر بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد زێتر بێت و بالاّتر بڕوات.

هـەرکات سیاسـەتی سـۆڤیەت وایپێویـست کردبـا، کـە پـشتگیریی لـە ڕژێـم بکرێـت ، دەبـا پـارتی کۆمۆنیـستی عێـراق دەسـتبەجێ چـاولێکەربا، بـا ئـەو هەڵوێستە نوێیەی تەواو پێچەوانەی پێشینیشی بـا.

بۆ نموونە، هەڵوێستی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بەرامبەر شەڕڕاگرتنی ڕژێم و بزووتنـەوەی نیشتمانیی کـورد لـە فێبریـوەری ١٩٦٤ دا، لەسـەرەتادا نـاڕازیـانـە بـوو، بەلاّم هەر سۆڤیەت پشتگیریی و ڕەزامەندیی خۆی ڕاگەیاند، پارتی کۆمۆنیستی عێراق بایپێدایەوە و هەڵوێستی خۆی گۆڕی.

نموونەیەکی دی لەوبابەتە هەڵوێستی پارتی کۆمۆنیست بووبەرامبەر بەعس، پاش ڕێکەوتننـامەی عێراق و شوورەوی لە ١٩٧٢ دا.

بەشـــداریی پـــارتی کۆمۆنیـــستی عێـــراق لەبـــەرەی حوکومەتـــدا، پێـچکردنەوەیەکی عەنتیکـە بـوو لـە سیاسـەتی کۆمۆنیـستدا بەرامبـەر بـە مەسـەلەی کـورد. لەوشـەڕەی ١٩٧٤-١٩٧٥ ی نێـوان کـورد و ڕژێمـی عێراقـدا، بەشداریی چەکدارانە و پشتگیریی سیاسیانەی پـارتی کۆمۆنیست و کۆمـەکی ئیعلامـی و سـوپایی سـۆڤیەت، ڕۆڵێکـی هێجگـار گرنگیـان لەچارەنووسـی مەسەلەکەدا دیت.

پاش کۆتاییهاتنی شەڕەکە، ڕژێم چەکهەڵگرەکانی پارتی کۆمۆنیستی چەك کـرد و وەك قوتیلـەی تەویلـە پفـی لێکـردن، لەگـەڵ ئەوەشدا پـارتی کۆمۆنیـست، لەسەرپشتگیریی سیاسیانەی ڕژێم، هەربەردەوام بوو. ئـەو شۆڕشـە نوێیـەی لـە ١٩٧٦ دا هەڵگیرسـایەوە، لەلایـەن کۆمۆنیـستی عێراقـەوە بـەدوژمنـانی ڕژێمـی شۆڕشگێڕ و بە بەکرێگیراوانی ئیمپریالیزم جوێنباران دەکرا. (٤٧)

خۆپیشاندانی شیعەکانیش لە فێبریوەری ١٩٧٧ دا، لەلایەن کۆمۆنیستانەوە بە بزووتنەوەی کۆنەپەرستان نێو دەبرا.

لێکتێنەگەیشتنی ڕژێم و پارتی کۆمۆنیست، لەم مەسەلانە بەدووربوو، لەبواری دیدا ڕوویاندەدا. بۆنموونە کۆمۆنیست ڕەخنەی ئەوەی لەڕژێم دەگرت کە پەیوەندیی بازرگانیی لەگەڵ ڕۆژئاوادا لە ١٩٧٥ەوە تا ١٩٧٨ زۆر برەو پێداوە و ئەمەش گومان دەخاتە سەر ڕێبازی سۆسیالیستانەی ڕژێم.

پاش ڕێکەوتنی ڕژێم لەگەڵ شای ئێران لە ١٩٧٥ دا، پاش نەمانی خەتەری کورد و ئێران، ئەوەبوو ڕژێم ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەلای ڕۆژئاوا و عارەبی سعودیدا بایدەدایەوە. لە ١٩٧٧ ەوە قڕە کۆمۆنیست دەستیپێکردەوە. ١٩٧٨ ژمارەیەك کۆمۆنیست لەداردران، لەسەرئەوەی گوایە لەڕیزەکانی سوپادا سەرگەرمی چالاکیی سیاسی بوون. لەکۆتایی ئەو ساڵەدا (مانگی هەنگوین) کۆتایی پێهات و بەرەی کۆمۆنیست و بەعس هەڵوەشایەوە و سەردەمێکی نوێ لە داپڵۆسینی کۆمۆنیست دەستیپێکردەوە، کە سۆڤیەتیش لەسەری بەدەنگهات و ناڕەزایی دەربڕی. ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانی کۆمۆنیست قەدەغە کران، سەرکردە و کادێرەکانیان لە ١٩٧٩ وە، یا لەزینداندا توندکران، یا کەوڵی خۆیان لەدەباخانەی ڕژێم قوتارکرد و هەمدیسان لە ئەشکەوتەکانی کوردستانیان توندکرد.

لەسەرەتای جەنگی ئێران و عێراقدا، پارتی کۆمۆنیستی عێراق، ڕژێمی عێراقی تاوانبار دەکرد و پشتگیریی خۆیی لە (شۆڕشی دژ بەئیمپریالیزم) ی گەلانی ئێران دەردەبڕی. لە ١٩٨٣ وە ئاوازێکی دی دەستیپێکرد، عێراق

چاولەدەستی کۆمەکی سوپایی سۆڤیەت بوو، سۆڤیەتیش هیوای ئەوەی لە دەست دابوو کە حیزبی تودە بتوانێت بزمارەکەی مەلای مەزبوورەی لە دیواری ڕژێمی ئێران بۆ بچەقێنێت، چونکە ئێران تودەی قەدەغەکرد و سەرکردەکانی گرتن و ئیعتیرافاتی هێجگار بێتامی پێکردن. بزووتنەوەی موسڵمانانی عێراق، کەسەر بەئێران بوو، ڕازیی نەبوون لەگەڵ کۆمۆنیستی عێراقدا هاریکاریی بکەن، بۆیە کۆمۆنیستیش بایدایەوە و گێڕی گۆڕی. ئەو بارە لەقە بۆن و بەرامەی ئەوەی لێدەهات کە هەمدیسان گۆڕانێکی نوێ بەسەر پەیوەندییەکانی ڕژێمی عێراق و پارتی کۆمۆنیستدا لەلایەك و ڕژێمی عێراق و یەکێتی سۆڤیەت لەلایەکی دییەوە، بێت. یەکێك لە هێما و نیشانەکانی ئەو گۆڕانکارییە چاوەڕوانکراوە، کە دوورنییە هاریکاری نێوان پارتی کۆمۆنیست و ڕژێمی عێراق بسازێنێتەوە، گەرعێراق جارێکی دی مل بۆ خواستەکانی سۆڤیەت بدات، ئەو گوتەیەی هاوڕێ زەکی خەیری، ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی کۆمۆنیستی عێراقە، کە لەیادی سەدساڵەی مردنی کارل مارکس دا لە بەرلینی خۆرهەڵات خوێندییەوە. لەو بۆنەیەدا کەوەفدی بەعسیشی تێدا بەشداربوو، خەیری هەڵوێستێکی بێلایەنانەی لە جەنگی ئێران و عێراق نیشاندا داوای کۆتاییپێهێنانی جەنگی کرد و ڕایگەیاند کەبەهێنانەکایەی حوکومەتێکی ئیئتیلافی لە عێراقدا، گشت تەنگ و چەڵەمەکانی عێراق چارەسەر دەکرێت. پێشهاتێکی لەو بابەتە، پەیوەندییەکانی نێوان بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد و پارتی کۆمۆنیستی عێراق هەڵدەتەکێنێتەوە.

لەگەڵ گوڕوتین پەیداکردنی سیاسەتی سۆڤیەت لە ڕۆژهەڵاتدا، هەتادێت پارتی کۆمۆنیستی عێراق و پارتە کۆمۆنیستەکانی دی ناوچەکە، زێتر و زێتر سەربەخۆیی خۆیان لەدەستدەدەن و وابەستەی سیاسەتی زلهێزانەی سۆڤیەت دەبن. بۆیە تادێت لەلایەن ڕژێمەکان و هێزە مەڵبەندییەکان و بزووتنەوەی نیشتمانیی کوردەوە، زێتر وەکو نوێنەرێکی سیاسەت و بەرژەوەندیی زلهێزانەی سۆڤیەت تێیانبەڕواندرێت و هەرواش مامەڵە دەکرێن".

لە زنجیرەی ئەم گەشتەدا کە کاك فازڵ زۆر وورد و پیتۆڵانە بەدەورو ڕۆڵی پارتە کۆمۆنیستەکاندا کردوویە، چەند ڕایەکی دەربڕیوە کە پێویستیان بە لێدوان و بەدوودا چوون هەیە. بەڵام نەمویست زنجیرەی باسەکە بپسێنم، بۆیە وا بەناچاری ئێستا دەگەڕێمەوە سەریان:

وەك لە لاپەڕە ١١٥ دا ڕوونمانکردەوە، کاکە فازڵ دەنووسێت: "یەکێك لەئامرازەکانی دیکە، ڕۆڵی پارتە کۆمۆنیستەکانی ناوچەکە و ئەو وولاتانەن کە پشتگیریی ئامانج و سیاسەتی سۆڤیەت دەکەن. سەرەڕای ئەوەش نرخاندنی ئەو پارتە کۆمۆنیستانە وەکو داردەست و قەرەقۆزێکی دەستی سۆڤیەت، یەك لایەنە و هەڵەن، چونکە پارتە کۆمۆنیستەکانی ناوچەکە، زۆرجار بەرژەوەندییە ناوچەییەکان ڕەچاودەکەن و هەندەجارێك گێرمە و کێشەی ئیدیۆلۆژی لەسەر مەسەلەی نیشتمانیی و کەمەنەتەوەییەکان هەڵدەستێنن".

لەپەراوێزی ژمارە ١ دا کە لە لاپەڕە ٣٥٧ دا ڕوونیکردۆتەوە، لەو بارەوە دەنووسێت: "لەسەردەمی بریژنێڤ دا، لەکاتی برەو پەیداکردنی گرنگی و بارو دۆخی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست لە سیاسەت و دەستەڵاتی زلهێزانەی سۆڤیەتدا،

پەیوەستی و ڕەدووکەوتنی پارتە کۆمۆنیستەکانی ناوچەکە بە مۆسکۆوە ڕوو لە زیادی بوو".

ئەم ڕاوبۆچوونانەی کاك فازڵ پێویستیان بە هەڵوێستەیەك هەیە، چونکە بۆچوونەکانی تەواو هاوکێش نیین و باری سەرنجەکانی جێگەی تێڕامانن و مەودای ڕادەربڕینی زێتریان لەسەر هەیە. بۆیە هێندەی بشێت و بگونجێت و بوار هەبێت، بە پێویستی دەزانم ڕای خۆمیان لەبارەوە دەربڕم:

١-سەبارەت بەوەی گوایە "ئەو پارتە کۆمۆنیستانە داردەست و قەرەقۆزی دەستی سۆڤیەت نیین". پێموایە بۆچوونێکی دووفاقانەیە، چونکە ئەوان خۆیان بە ئەرك و پێویستییەکی ئینتەرناسیۆنالانەی دەزانن و بەبەرژەوەندییەکی بزووتنەوەی پرۆلیتاریای جیهان، کە شوورەوی بە تاکە سەرکردە و ڕێبەری لەقەڵەم دەدەن، بۆیە ئیلتیزامی یەکەم و هەرە لەپێشیان بە سۆڤیەتەوەیە. ناکۆمۆنیستەکانیش بە نوێنەر و پارێزەری بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت و قوڕەچەورەی دەستی ئەو دەوڵەتە. سەراپای ئەو گەشتەی کاك فازڵیش پێشچاوی خستین هەر نوقلانەی ئەوەیە. ئیدی ئەگەر ئەوە داردەستی نەبێت، دەبێت داردەستی چبێت؟

سەرپاکی پارتە کۆمۆنیستەکانی ناوچەکە، بەڕازیبوون و ڕێگەدانی کۆمینتێرن دامەزراون. وەکو لە ل٢٤ دا ڕوونمانکردەوە، کۆمێنتێرنیش ئامراز و ئامێرێکی دەستی سۆڤیەت بوو. هەر لەسەرەتای دامەزراندنیانەوە تاکو ئەورۆ، تاکە بەڵگە و پێشهاتێك بەدیناکرێت، کە یەکێك لەو پارتانە سەرپێچییان لە پێداویستییەکانی مسۆگەرکردنی سیاسەت و بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت

کردبێت، بەڕادەیەك وابەستە و گەرمە تەریقەت بوون، کە دەتوانین بڵێین ئەو ئیلتیزامە ئەخلاقی و پێویستەی نەتەوەییە ئازادیخوازەکانی میللەتێکی وەك کورد بەنەتەوەکەی خۆیانەوە هەیانە و کۆمۆنیستان بە شۆڤێنیستی و دەمارگیریی بۆیان تێدەخوێننەوە، کە لە ئەسڵدا بێبنچینەیە، ئەوان سەد هێندەی ئەوە و لەوەش پتر بۆ سۆڤیەت دەمارگیر و شۆڤێنیستن.

ئەو نموونانەی کاکی نووسەر لەسەرتاسەری ئەم گەشتە مێژووییەدا پێشچاویخستووین، هەر لە پارتی کۆمۆنیستی تورکیا و هاریکارییان لەگەڵ گورگێکی وەك ئەتاتورکدا، تا دامەزراندنی پارتی کۆمۆنیستی ئێران و بەشدارییان لە کۆماری گیلان دا و پاشان بەرهەڵداکردنی کۆمارەکە و ڕووکردنە خوێنڕێژێکی دەمارگیری وەك ڕەزاشا، (٤٨) ئەوجا تودەی ئێران و هەڵوێستی لە کۆماری ئازربایجان و کوردستان و ئالیکاریی لەگەڵ قەوام سەڵتەنە و ئا لەم دواییەشدا لەگەڵ ئەو ڕوحوڵڵایەی ڕۆحیانی دابەتەنووردا، تا پارتی کۆمۆنیستی سوریا و هەڵوێستیان لە ڕژێمە یەك لە دووی یەکەکان و سیاسەتی نێوزڕاوی پشتێنی عارەبی و پاشانیش کۆمۆنیستی عێراق و هەڵوێستیان بەرامبەر دیکتاتۆرێکی وەك قاسم و جووتە عارف و بەعسی دوای ١٩٦٨ و پاشان ئەو (بەرەی نیشتمانییە پێشکەوتنخواز)ەی خایە و مایەی خۆیان لەسەر دانا و بووە لەکەیەکی ئەزەلی بەتەوێڵی کۆمۆنیستی عێراقەوە.

ئا ئەمانە هەرهەمووی یەك ڕاستیی زەق و ڕەق و تەق نیشاندەدەن، ئەویش ئەوەیە کە سەرپاکی ئەو هەڵوێستانە، نە لە بەرژەوەندیی پارتە کۆمۆنیستەکان خۆیان بووە و نە لە بەرژەوەندیی میللەتانی، بەڵکە تەنها و تەنها خزمەتی

بەرژەوەندییەکی کاتیی دەوڵەتی شوورەوییان کردووە. بۆیە تادێت ئەو حیزبانە ڕوو لە پووکانەوە و کزی و کەنەفتی دەکەن و باری ناوچەکەش ئاڵەو ئاڵۆزی و باڵۆزییەدا چلوورەی بەستووە و سەقامگیر بووە.

بەکوردییەکەی، ئەو حیزبانە هیچکات خاوەنی ڕای خۆیان و هەڵوێستی خۆیان نەبوون، هەمووده‌م سایە و ساباتی سیاسەت و بەرژەوەندییەکانی شوورەوی بوون. بە پێویستییەکی بالاتر لە بەرژەوەندیی و ئەرکی نیشتمانیی هەڵسوکەوتیان کردووە. تا ئەو سیاسەتە سکەبۆکێشراوە حاڵی شرپیانی بەوە گەیاندووە، کە گەلەکجار بەهەق بە هەلپەرست و بێبار و ئۆپۆرتونیست نێوببرێن.

ئێمە تاکە نموونەیەك بەدیناکەین کە هەڵوێستی پارتە کۆمۆنیستەکانی ناوچەکە، بەموو لە سیاسەت و ڕەوڕەوەی بەرژەوەندیی سۆڤیەت لایدابێت. لە حاڵەتێکدا گەر هەڵوێستیان لەسەر ڕووەختێکدا و لەشوێنێکدا، پڕاوپڕ وەکو ئەوەی سۆڤیەت نەبووبێت، یەکێك یاخود لەیەکێك زێتر لەم چوار هۆیەی هەبووە:

١-یا ڕژێمە ڕوو بە سۆڤیەتدەرەکە، ڕووی بە پارتە کۆمۆنیستەکەی وولاتەکە نەداوە، وەك سەردەمێکی فەرمانڕەوایی ناصر لە میسر و سەردەمی عارفی یەکەم لەعێراق.

٢-یا شوورەوی خۆی ڕایسپاردوون کە هەڵوێستی چاوزیتکردنەوە و گوشار و زۆربۆهێنان وەبەربگرن، ئەویش بۆ ملدانی زێتری ڕژێمەکە بۆ خواستەکانی سۆڤیەت.

٣-یا پارتە کۆمۆنیستەکە لەهەڵوێست وەبەرگرتندا پەلەی کردووە و خۆی پێڕانەگیراوە، وەك هەڵوێستی کۆمۆنیستی عێراق بەرامبەر ڕێکەوتنەکەی ١٩٦٤ ی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد و ڕژێمی عارف.

٤-یاخود پەیوەندییە ئینتەرناسیۆنالەکە بە نێوەندەوە پچڕاوە و دەنگیان بەیەکدیدا ڕانەگەیشتووە.

بریا و خۆزیا کاکە فازڵ بە تاکە نموونەیەك دڵنیای کردباین کەی و لەکوێ و چۆن تاقە پارتێکی کۆمۆنیستی وابەستەی سۆڤیەت، جارێك لە جاران، بەرژەوەندییە نیشتمانیی و ناوچەییەکانی پێش بەرژەوەندییە ئینتەرناسیۆنالەکە، یانی بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت خستبێت. ئەوان هەمیشە گوتەکەی لینینیان بەکردا رتەرجەمەکردووە، (قوربانیدان بەبەش لەپێناوی گشتدا).

٢-سەبارەت بەوەی گوایە (لەسەردەمی برێژنێڤدا، وابەستەیی پارتە کۆمۆنیستەکان بە سیاسەتی مۆسکۆوە ڕوولەزیادی بووە).

ئەزپێموایە گەر بشێت و بلوێت سنوورلەنێوان مەودای وابەستەیی پارتە کۆمۆنیستەکان بە سۆڤیەتەوە، لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە بکێشین، ئەوا هیچکات بەوزەقی و زۆری و ئاشکراییەی سەردەمی ستالین نەبووە، کە وادەزانم ئەویش کۆمەڵێك هۆی خۆی هەیە، کە دەتوانین گرنگترینیان لەم خاڵانەدا کۆوەکەین:

١-بوونی کۆمێنتێرن وەکو ڕووپۆشێك بۆ پەیوەندیی و پەیوەستیی بەسۆڤیەتەوە.

٢-لەڕووی دەروونییەوە، زۆری سەرکردەی پارتە کۆمۆنیستەکان، هێشتا لەدڵەوە باوەڕیان بەوە هەبوو، کە یەکێتی سۆڤیەت، تاکە ڕێبەرو پێشڕەوی هێزی پرۆلیتاریای جیهان و پارتە کۆمۆنیستەکانە، هێشتا سیاسەتی زلهێزانەی عەیان نەبووبوو، خەوش و عەیبە و تەماعبازییەکانی ڕژێم و سیستێمی ئەو وولاتە ئاشکرا نەبووبوو.

٣-ئەولێکترازان و دووبەرەکییانەی لە ناوەڕاستی پەنجاکان بەدواوە، لەڕیزی پارتە کۆمۆنیستەکاندا ڕوویاندا، کارێکی وایانکرد، کە لەوەپاش هۆشیارانەترو ڕووپۆشانەتر ئەو پەیوەندییانە بەڕێخەن، چونکە پشکی زۆری ئەو دووبەرەکی و لێکترازانانە، لەسەر مەسەلەی ئەو پەیوەندییانە سازان.

٤-خەتەری فاشیزم و نازیی ئاڵەمانیا و بۆن و بەرامەی بەرپابوونی جەنگێکی جیهانیی ، سەرپاکی حیزبە کۆمۆنیستەکانی بۆ ئامێزی شوورەوی ڕادا و لە دەوری ڕێبەرایەتی یەکە دەوڵەتی کۆمۆنیستی خڕیکردنەوە.

٥-نەفسی چڵێس و دیکتاتۆرئامێزی ستالین، کە تەماعی داگیرکاریی و بەربلاوکردنی هێزو دەستەلاتی لەدەروونیدا قوڵپی دەدا.

هەرئەو دەروونە چڵێسە دنەی دەدا ئەوتاوان وخوێنڕێژییانە بکات، کە کردنی و زۆربەی هەرەزۆری کۆمۆنیستانی جیهان چەپڵەیان بۆ دەتەقاند. زێتر لە دوو ملوێن کەسی لە ئەندامانی پارتی کۆمۆنیست و نەقابەکان گسك لێدا. دەیان و سەدان هەزار نەفەری ئیعدام کرد. تەنها لە ئەندامانی کۆمیتەی نێوەندیی پارتی کۆمۆنیستی شوورەوی، ٪۷۰ یان بەداردا کران. ٪۸۰ ی

نوێنەرانی دواهەمین کۆنگرەی پارتەکەی هەڵواسی. ئەوەی مایەوە و خەڵەسی، بووە کۆیلە و خزمەتکاری گوێ لەمست و بێ چەند و چوونی ستالین.

سێ ساڵی تەواو دادگاکان خەریکی بەڕێکردنی قوربانییەکانی ئارەزووی ستالین بوون. سەرپاکیان بەتۆمەتی خیانەت و تیرۆریستی و سیخوڕی ئینگلیز و ئەمریکا و ئاڵەمانیا و ژاپۆن لەداردران. تاکە کەسێك کە لە ئاستی ئەو تاوانانەدا بەدەنگهات، ترۆتسکی بوو. ترۆتسکی ڕایگەیاند: "کە ئەو تۆمەتانە نەك هەر ڕاست نیین و بە زۆری ئەشکەنجە قوربانییەکان ناچارکراون دان بەتاوان و خیانەتی خۆیاندا بنێن و ئەوە ڕووداوێکی بێژووی تاکڕەوی و دیکتاتۆرئامێزی ستالین نییە، بەڵکە هەڵتۆقیوی سیستێمێکی گێڕ و پڕهەڵە و بێدادی حوکومەتێکە کەلە سۆڤیەتدا بەرقەرارە".

ترۆتسکی ئاشکرا دەیگوت: "مارکس و ئێنگلز و لێنین، هەمیشە کۆمەڵایەتی سۆسیالیزمیان لە خەتەری بیرۆکراتێتی بەئاگاهێناوەتەوە و هەوڵیانداوە کۆمەڵایەتی سۆسیالیستی لێبەدوور بگرن و نەهێڵن بکەوێتە ئەو هەڵدێرەوە. بەلام ئەوەی ئەوان ترسیان لێیهەبوو ئەوڕۆ لە سۆڤیەتدا حوکمفەرمایە. کەواتە خیانەت لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر کراوە و ڕژێمی شوورەوی لە ڕاستەڕێی سۆسیالیزم لایداوە و بە چەوتەڕێدا براوە".

ترۆتسکی گشت کۆمۆنیستانی جیهانی بۆ بەرهەڵستکاریی ئەو لادانە بانگدەهێشت. لەبەر ئەوەی ڕێبەرانی کۆمێنتێرنی بە شەریکە تاوانی ستالین و ژێرچنگۆڵەی ڕژێمی بیرۆکراتی سۆڤیەت دەزانی، بۆیە بانگی ئینتەرناسیۆنالی چوارەمی هەڵدا و ئالای دژایەتی ستالینی هەڵکرد.

ده سەریاکی کۆمۆنیستانی ڕۆژهەڵات، سەری ڕەزامەندییان بۆئەوتاوانانە دەلەقاند. پێموایە گەر ستالین سەرکردەی وولاتێکی کۆمۆنیست نەبا، کۆمۆنیستانی جیهان لە هێتلەرو مۆسۆلۆنی کەمتریان پێنەدەکرد.

بەبڕوای من، بەراوردکردنی مەودای ئەو وابەستەییە لەسەردەمی دەستەلاتداریتی سەرکردەیەکەوە بۆ یەکێکی دی، وەکی ئەوە وایە مرۆ بڵێت ئەم بەفرە لەو بەفرە ساردترە، چونکە کاری هەرەلەپێشی ئەوان، بە ئەنجامگەیاندنی ئەوئەرکەیە، ئیدی کێ دەستەلاتدارە، گرنگ نییە.

کەواتە ئەووابەستەیی وپابەندییە کوێرانەیە، ڕووداوێك نییە لەسەروەختی برێژنێڤدا، تین وکەف وکوڵی زیادی کردبێت، بەڵکە بەردەوامیی ڕەوتێکە کە هەرلە سەرەتاوە وەبەرگیراوە. بۆیە ڕاستتروابوو کاك فازڵ بنووسێت: (لەسەردەمی برێژنێڤدا، لەکاتی برەوپەیداکردنی گرنگی وبایەخی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست لەسیاسەتی سۆڤیەتدا، کێش ولەپێشی پارتە کۆمۆنیستەکانی ناوچەکە، بەنیسبەت شوورویيەوە ڕوولە زیادی بوو).

پاشان نووسەر دێتەسەر باسی کەمەنەتەوەیی کورد لەسۆڤیەت و دەنووسێت: "بێشك کەمەنەتەوەیی کورد لە سۆڤیەت، لە نەخشە وپلانی سیاسەتی سۆڤیەتدا کەمە بایەخێکی هەیە، بەلاّم هاندەری سەرەکیی مەیلی سۆڤیەت نییە بەلای کورددا.

لەنێوان سەدەکانی ١٠ و١٢ دا، مەڵبەندێکی زۆری قەفقاز، کە ئێستا بەشێکی کوردی لێدەژی، لەژێر دەستەلاتی میرنشینی شەددادیدا بوو، جگەلەوە

کوردێکی زۆر لەسەدەکانی ١٧ و ١٩ دوە بۆ کوردستانی ئەورۆکەی شوورەوی ڕەویانکرد، ئەو ڕەوکردنە سێ هۆکاری هەبووە:

١-هۆکاری ئابووری، کە هەندەك تیرە و هۆزی کۆچەری بەرەو باکوور ڕا مالّی، بەو هیوایەی لەوەڕگەی باشتر بدۆزنەوە.

٢-بە هۆکاری ئاینی ، هەندەك تیرە و خێلّی کوردە ئێزدییەکان لەدەست جەورو ستەمی موسلّمانان هەلّهاتن.

٣-شەڕی ڕووس و ئێران، ڕووس و عوسمانی. ڕووس لە جەنگەکانی سالاّنی ١٧٢٠-١٧٢٢ و ١٨٠٤-١٨١٢ دا ژووروی ئێرانی داگیرکرد، کەبەشێکی مەلّبەندی کوردنشین بوو. هەروەها لەشەڕەکانی ١٨٥٣-١٨٥٦ دا ، پاشان ١٨٧٧-١٨٧٨ ی ڕووس و عوسمانیدا، کە هەمان سەرئەنجامیان هەبوو، جگەلەوە هەندەك تیرە و عەشرەتی کورد لەو شەڕانەدا دایانەپالّ ڕووسەکان.

ژمارەی کوردی سۆڤیەت، تائێستا بەتەواوی نەزانراوە. ڕووسیای تەزاری لە ١٨٩٧ دا، ژمارەی کوردی بە ١٠٠ هەزار نەفەر دەقەبلاّند. لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی سۆڤیەتەوە ژمارەکان جوداوازن، بۆ نموونە ١٩٢٩ ژمارەی کورد بە ڕەسمیی ٥٥ هەزار بوو، کەچی ٣٠ سالّ دواتر، یانی ١٩٥٩ دەبنە ٥٩ هەزار (٤٩)

بەلاّم لە لێکۆلّینەوە ئەکادیمییەکاندا جۆرێکی دییە، بۆنموونە ئاریستۆف لە ١٩٥٤ دا، ژمارەی کوردی سۆڤیەت بە ١٦٠ هەزار دەخەملّێنێت.

دامەزرانی یەکێتی سۆڤیەت، لەڕووی کولتورییەوە پێشکەوتنی چاکی بەسەر ژیانی کوردەکانی ئەوێدا هێنا. ژمارەی نەخوێندەواران کەمبووەوە و ژمارەی

خوێندەواران باڵا ڕۆیشت. نووسین و بڵاوکردنەوەی کوردی دەستیپێکرد. بەڵام هەمانکات بووە هۆی قرتاندنی پەیوەندیی کوردی ئەوێ بە کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستانەوە. لە بیستەکاندا، ئەو دەمەی پەیوەندیی شوورەوی و کەمالیستەکان لە شکۆفەدا بوو، سۆڤیەت گەلەك گوندی کوردنشینی لەسەر سنووری تورکیا، ڕاگوێزا.

ساڵی ١٩٢٧ ، مەسەلەی دامەزراندنی کۆمارێکی کورد لە شوورەوی، لەلایەن کاریەدەستانەوە خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە، بەڵام وەزارەتی دەرەوە ئەو پێشنیازەی دایە دواوە، بەو بیانووەی گوایە پەیوەندیی لەگەڵ ئێران و تورکیادا شلۆق دەبێت، کە ئەو کاتە بۆ شوورەوی زۆر پڕبایەخ بوو.

لەسەردەمی ستالیندا باری کورد گەلەك خراپ بوو. لەسەردەمی خرۆشۆفدا گۆڕانی چاکی بەسەردا هات. هەتا لەسەردەمی ئەندرۆپۆفدا، هیوای دامەزراندنی کۆمارێکی کوردییش گەشەیکرد، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی ئەو گوتەیەی ئەندرۆپۆف دا، کە لە نۆڤەمبەری ١٩٨٢ دا گوتی: "ملوێنەها ئاڵەمان و بولگار و کۆریایی و کورد و نەوەی گەلەکانی دی، کەلەمێژە سۆڤیەت بۆتە نیشتمانیان، هەمان مافی تەواوی هاونیشتمانیانی سۆڤیەتیان هەیە".

پاشان نووسەر دێتە سەرباسی باری کوردۆلۆژی لە یەکێتی سۆڤیەتدا. ئەوجا دێتە سەرباسی چۆنیەتی هەڵگێڕانەوە و شێواندنی ڕاستییەکان و تێکدانی مێژووی کورد بەپێی سیاسەت و خواستی بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت، پاشانیش باپێدانەوە و پەژیوانبوونەوە لە بڕێکیان. ئەوەش ئاشکرا دەکات کە گەلەك لەو نووسین و توێژینەوانەی دەربارەی کورد دەنووسرێن، دەشاردرێنەوە و

بـواری دەستپێداگەیـشتنیان نییـە. هـەتا هەنـدەك لـە خوێنـدكارانی دوكتـۆرا، ڕێگەنادرێن كۆپییەك لە كارنامەكەی خۆشیان لەكن خۆیان گلبدەنەوە.

لێرەدا هەندەك لەو نموونە شێوێندراوانە پێشچاو دەخەین، كە هەڵگێڕانەوەی ڕاستییە مێژوویەكان ئاشكرا دەكەن:

١-شۆرشـی ١٩٢٥ بەسـەركردایەتی شـێخ سـەعیدی پـیران دژی توركیـای كـەمالیی، ئـەوكاتـە لەلایـەن سـۆڤیەت و كۆمۆنیـستانی ئـەودەمـەوە، بـە یاخیگەرییەكی ئاینیی كۆنەپەرست و بەكرێگیراوی ئینگلیزلەكەدار دەكرا. ئەم هەڵسەنگاندنە بێویژدانانەیـە، هـەتا چەندسـاڵێكیش لەمەوبـەر، لـە لێكۆڵینـەوە زانـستییەكاندا! باڵیكێـشابوو. بـەلاَم چـەند سـاڵێكە باپێدراوەتـەوە و ئێـستا بەڕاپەڕینی كورد لەدژی كوشتاری خوێناویی كەمالیستەكان نێودەبرێت.

٢-هەڵوێـستی سـۆڤیەت بەرامبەر ئـەوپەیماننامانـەی پـاش یەكـەم جـەنگی جیهـانیی كە چارەنووسی كوردیـان بڕانـدبووەوە، ڕوون بـوو. دژی پـەیمانی سیڤەر بـوون، كـە یەكـەمجار بـوو لەسـەر ئاسـتێكی نێودەوڵـەتی، مـافی دامەزرانـدنی دەوڵـەتێكی كـوردیی دانیپێـدانراوە. بەپـەیمانی لـۆزان ڕازیبـوون كـە كوردسـتانی لـەت وپەت كرد و مـافی كـوردی ژێرپێخست. كەرتكردنی كوردسـتان، كە بەلای سۆڤیەتەوە سەر بـە ئینگلیـز بـوون، گـرنگ نییە، بـەلاَم لـەتكردنی توركیـا كـە ئـەو كاتە دۆستی نێزیكی شوورەوی بوو، نارەوا و نابەجێیە.

ئێستاكە ئەو حاڵوبارە ئاوها هەڵدەسەنگێنن:

"ئینگلیـز و فەرەنـسییەكان هەوڵیانـدەدا، بـاری نـاڕەزایی كـورد بقۆزنـەوە و كۆمـەك بـە ڕاپەڕینـەكانیان بكـەن، تـا بـەگفت و بـەڵێنی ئۆتۆنـۆمی، دژی توركیـا

هەڵیانسووڕێنن. کە تورکیا بەرژەوەندییەکانیانی بۆ مسۆگەرکردن، ئەوانیش کوردیان بەرهەڵدا کرد".

٣-گرنگترین ڕووداوێك لەبواری سیاسەت و هەڵوێستی سۆڤیەتدا بەرامبەر بەکورد، مەسەلەی کۆماری مەهابادبوو. ساڵانێکی دوورو درێژ ئەم مەسەلە و پێشهاتە گرنگەیان دەشاردەوە و هیچ لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەوە نەدەنوسرا. مەسەلەش ئەو دەلاقەی عەیبەیەبوو، کە سۆڤیەت لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیی پاشەکشەیکرد. کوردیش هەستیدەکرد کە شوورەوی بەگورگان خواردووی داون. لەو نووسینانەدا کە لە مێژووی ئێران و ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست دەکۆڵنەوە، یا هەر هیچ ، یاخود زۆر کورت و سەرپێیی خۆ لەقەرەی ئەو ڕووداوە دەدەن. هەتا لەو کتێبەدا، (مێژووی دیبلۆماسیی شوورەوی ١٩٤٥-١٩٧٦)، کە بە سەرپەرشتیی گرۆمیکۆ لە ١٩٨٠ دا چاپکرا، لەگەڵ ئەوەدا کە زۆر مەسەلەی لاوەکی و کەمبایەختر باسدەکات، کەچی بەیەك ووشە خۆ لەقەرەی کۆماری مەهاباد نادات.

پێشەوا قازی محەمەد، کە هێما و نیشانەیەکی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردە، هەر لەسەرەتاوە ، لەچاپەمەنییەکانی سۆڤیەتدا بەدۆستێکی شوورەوی و زۆر بەچاکە باسدەکرا، کەچی لەپڕێکدا ، لەکارنامەکەی د. عەزیز شەمزینی دا، (بزووتنەوەی نیشتمانیی گەلی کورد لەنێوان ١٩٤٢-١٩٤٦ دا) کە خۆی یەکێك لە ئەفسەرەکانی کۆماری مەهاباد بووە، پێشەوا دەکرێتە دەرەبەگێکی گەورە و سیاسەتمەدارێکی سەر بە ئەمریکا. لە هەندەك توێژینەوەی شاردراوە و نهێنییشدا، ئەو دوو درۆ پەتییە کاوێژکراونەوە.

٤-مەسەلەیەکی دی کێشەی کورد و ڕژێمی قاسمە، لە ١٩٦١ەوە بۆ ١٩٦٣. هیچکات لەبڵاوکراوەکانی سۆڤیەتدا، دژی ئەو تاوانانەی قاسم نەوەستانەوە. چونکە نەیاندەویست لەوەڕگەی عێراقیان لەکیس بچێت. بەڵام پاش سەرنگومبوونی قاسم، بڵاوکراوەکانی سۆڤیەت هەستیانکرد! کە قاسم تاوانکار و شەڕهەڵگیرسێن بوو. بەعسی ١٩٦٣ بە تاوانکار و فاشیست و لەوبابەتە باسدەکرا، بەڵام بەعسی ١٩٦٨، کە داوی پەیوەندیی چاکی لەگەڵ سۆڤیەتدا بەست، بەو دڕندەیی و تاوانکارییە نەما.

٥-هەڵسەنگاندنی پارتی دێموکراتی کوردستان، بەسەرکردایەتی بارزانی، نموونەیەکی دییە. ئەم پارتە هەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە تا ١٩٧٤ پەیوەندیی لەگەڵ سۆڤیەتدا چاك بوو. شوورەوی لەدژی ڕژێمە یەك لە دووی یەکەکانی عێراق پشتگیریی لێدەکرد. هەتا پەیوەندیی ڕەسمییشیان هەبوو. بەڵام پاشان ئەمیش بەخراپە باسدەکرا. هەرچەندە ئەو حیزبە لە ١٩٦٦ەوە پەیوەندیی لەگەڵ ئەمریکا و ئیسرائیلدا هەبوو، سۆڤیەتیش چاك لێیبەئاگابوو، تا ١٩٧٤یش کۆمەکی پێدەکرد. تا ئەوکاتە زۆر بە چاکە باسی بارزانی و حیزبەکەی دەکرا، چ لە چاپکراوە گشتییەکان و چ لە لێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکاندا. بەڵام لەوکاتەوە کە حیزبەکە نەچووە بەرەی بەعس و کۆمۆنیستەوە و بێ ڕازیبوونی شوورەویی دژی بەعس جەنگا، ئیدی حیزبەکە کەوتە بەرشاڵاوی چاپەمەنییەکانی سۆڤیەتەوە. هەتا بەجۆرێکی دی باسی سەرەتای حەفتاکانیش دەکرا، ئەوکاتانەی بارزانی پەیوەندیی لەگەڵیاندا لەویەڕی چاکیدا بوو.

ئەو پیرماکۆفە ڕۆژهەڵاتناسەی کە یەکێك بوو لە بەرپرسانی پەیوەندیی کورد و شوورەوی و بەردەوام سەردانی بارزانی دەکرد، لە ١٩٧٩ دا کتێبێکی نووسی و کەوتە پێدا هەڵشاخانی بارزانی و حیزبەکەی بەبەکرێگیراوی ئەمریکا و ئیسرائیل نێودەبرد.

هەرلەگەڵ کۆتایی ١٩٧٠ لەگەڵ عێراقدا تێکچوون، بڵاوکراوەکانی سۆڤیەت کەوتنەوە پێداهەڵدانی بارزانی. پراڤدا گوتارێکی لازاریفی بڵاوکردەوە کە بارزانی بە (مەزنترین سەرکردەی سەدەی بیستهەمی کورد) نێودەبات.

# کۆتایی و سەرئەنجام

ڕۆژهەڵاتی نێوەند و نێزیك، ناوچەیەکە کە چەندین کێشەی ئێتنی و ئاینییان تێدا قەتیسماوە. ئەو کێشانە کە بنجێکی قووڵیان لەمێژووی ناوچەکەدا چەقاندووە، لەم ساڵانەی دواییدا، بەهۆی ململانێ و کێشمەکێشی زلهێزەکانەوە، لەهەڵچوون و کەف و کوڵێکی هەمیشەییدان. ئەو وڵاتانەی پاش یەکەم جەنگ لەم ناوچەیەدا هەڵتۆقین، کە گەلەکجار واپێدەچێت بایەخێکی زێتریان پێبدرێت لەوەی کەهەن، بەپێچەوانەی ئەو گەشە سروشتییە مێژووکردەی ناوچەکەوە، وەك ئیسلام و ناسیۆنالیزمی عارەبی، یاخود بەپێچەوانەی بەرژەوەندیی هەندەك نەتەوەوە، کە بەسەر چەند وڵاتێکدا بەخشراونەتەوە، وەکو کورد، دامەزرێنراون و قوتکراونەوە.

کەواتە ئەو وڵاتە تازانە، پێبەپێی گەشەکردنە مێژووییەکەی ئاین و نەتەوایەتی دانەمەزراون، بەڵکە زۆربەیان دەستکردن و پاش تەفروتووناکبوونی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی، بەپێی سوود و دەستکەوتی هێزە ئەوروپاییەکان ترەکیون.

سیستێمی سیاسی ئەو وڵاتانەی کوردیان بەسەردا تاڵانبەشکراوە، نەپلورالیستانەن و نە دێموکراسی. ئەو تێکەوڵێکە و دژایەتییە تێکچڕژاوانەی جەرگەی ئەو وڵاتانە، تایبەت کێشە ئاڵۆزە هێشتا چارەسەرنەکراوەکان، لەم

شێست ساڵەی دواییندا، ماکی هەمیشەیی ئەو گێژاو و شەڕەکوتەکە سیاسیانە بوون کە هێزی نێوخۆی ئەو وولاتانەیان شپرزە و کزو کەنەفت کردووە.

پاش گورو تاوسەندنی بیری نەتەوایەتی لەم ناوچەیەدا، تایبەت دوای دووهەم جەنگی جیهانیی، بوون و مانەوەی ئەو وولاتە داتاشراوانە، کەوتوونە غەرغەرەوە. بیری ناسیۆنالیزمی عارەب، کە ئامانجی یەکخستنی گشت عارەبە لەیەك نیشتمانی یەکگرتوودا، ئاشکرا دژی ئەو سنوورە هەڵتۆقیوانە دەوەستێتەوە. بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد، کە ئامانجی دووری، نیشتمانێکی یەکگرتووی کوردە، قەباڵە و دارەڕای چوار دەوڵەت دەخاتە بەر تەوژمی مەترسییەوە.

بزووتنەوەی بووژاندنەوەی ئیسلام، کە مەسەلە تەنها گەڕانەوە و پەنابردن نییە بۆ ئاین، بەڵکە هێنانەکایەی هێزێکی سیاسی حسێب بۆکراوە، ئەویش بەهۆی دانەدواوەی ئەو کولتوورە سەپاوە نامۆیەی ئەورویاوە بەسەر ناوچەکەدا، ئەو سنوورە قنجانە ژێرپێ دەخەن و هەوڵی گێڕانەوەی کۆمەڵایەتییەکی موسڵمانی یەکگرتوو دەدەن.

خۆخزاندنە نێوەوەی سۆڤیەت بۆ ناوچەکە و قڵپکردنەوە و گۆڕینی چەند دینگەیەکی هێز و دەستەڵات لەسەراسەری جیهاندا، تایبەت پاش کزی و لاوازبوونی دەستەڵاتی کۆنی هێزە ئەوروپاییەکان و برەو و گوڕپەیداکردنی زلهێزەکانی ڕووسیا و ئەمریکا، ئەوانیش خۆیان لە خۆیاندا هۆیەکی دیکەی گۆڕان لەناوچەکەدا دەخەملێنن.

بەقوتبوونەوەی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا، دەستەلاٌت و پێگەی پاوانکراوی ڕۆژئاوا لەقی و شلەقی و هێزە ناوچەییەکانیش مەودایەکی فراوانتریان لەبەردەمدا ئاوالّە بوو، بەڕادەیەك، کە ئەو کێشە ناوچەییانەی لەنێوان دوو جەنگەکەدا تەواو کپ و خاموٌش کرابوون، توانییان جارێکی دی سەرهەلّدەنەوە و گوڕوتین پەیداکەنەوە. ئەم ناوچەیە، تا دێت لەسیاسەتی زلهێزانەی سۆڤیەتدا، بایەخ و نرخی ڕوولە زیادی دەکات.

هێزە سیاسییە گوڕپەیداکردووەکانی ناوچەکە، شەست سالّێکە لەگەلّ هێزە ئەورووپاییەکاندا، لەدژایەتی و ململانێیەکی سیاسی و کولتووریدان. ئەو بارو دۆخە، هەل و دەرفەتی ئەوەی بۆ سۆڤیەت ڕەخساند، تا لەگەلّ هەندە هێزێکی تازەپێداکەوتووی ناوچەکەدا، ببێتە هاوکار و لەسەر ئاستی ئینتەرناسیۆنالانە، بوونی بەگەن بکرێت. هەرچەندە مۆدێلی سۆسیالیزمەکەی سۆڤیەت، گەلەك لە سەرچاوە ڕەسەنەکەی دوورکەوتۆتەوە و زۆر خەسلّەتی خۆی لەدەست داوە، بەلاٌم هەندەك هۆکار، زۆر هێزی ناوچەیی ناچاری هاریکاریی و هاوکاریی کردووە. لە حالّوبارێکدا، کەلەشێستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا، هەندەك ڕێبازی سۆسیالیستانەی ملّۆزمی سۆڤیەت پەیدابووبوون، بۆنموونە وەکو ڕێکخراوانێکی سەربە ڕێبازی ماویزم و جیڤاریزم، بەلاٌم لە نێوەڕاستی حەفتاکانەوە، ئیدی ئەو ڕێبازانەش پووکانەوە و مەیدانیان بۆ هێزە کۆمۆنیستە ڕەدووکەوتووەکانی سۆڤیەت چۆلّکرد، ئەویش زێتر بەهۆی ئەو هێز و گوڕەوە کە سۆڤیەت وەك زلهێزێك لەناوچەکەدا پەیدایکرد.

سۆڤیەت خۆشی دەستبەرداری بیروبۆچوونە کۆنەکانی ستالینیزم بووو جۆرەها شێوە و شیوازی هاریکاریی و هاوکاریی و خۆگونجاندنی لەگەڵ هێزە ناکۆمۆنیستەکاندا گرتەبەر، تایبەت لەگەڵ هێزە ناسیۆنالیستە گەشەکردووەکاندا. لەو ڕێگەیەوە ئاسۆیەکی فراوانی بێ کەوشەن لەبەردەم خۆتێترنجاندن و تین و تاو پەیدا کردنی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا ئاواڵە بوو.

لەپاش دووهەم جەنگی جیهانییەوە، بواری ڕاستەوخۆ هاتنەنێوەوەی سوپایی بۆ ئەم ناوچەیە، لەبەردەم هێزە ئەوروپاییەکاندا، تەواو بەرتەسك بووەوە. بەپێچەوانەی ئەوەوە، هەلودەرفەتی هاتنەنێوەوە و پێگە پەیدا کردن بۆ سۆڤیەت، ئاسانتر و فرەتر بوو. بۆ هێزە ئەوروپاییەکان زێتر دەروازەی وابەستەیی تەکنۆلۆژیا و ئابووری کرایەوە، بەلاّم بۆ سۆڤیەت هاوبەشی و لەکاتی پێویستیشدا، پشتگیری و کۆمەکی سیاسی و سوپایی. هەر بەوهۆیەوە پەیوەندیی ئابووری سۆڤیەت لەگەڵ وولاّتانی ناوچەکەدا، زێترلەسەر ئاستی سیاسی و سەربازییە، کۆمەکی چەك و تەقەمەنی و شارەزایانی مەیدانی جەنگە، ئەمە سەرەڕای هۆکاری باری سەپاوی ئابووری جیهان و پاشکەوتنی سۆڤیەت لەمەیدانی تەکنۆلۆژیای نوێی بەفرۆختدا.

ئیدی ئەمە مانای ئەوە نییە کە سۆڤیەت پشتگیریی هەموو هێزێکی بەرهەڵستکاری ناوچەکە دەکات، نەخێر، گەلەکجار کە سۆڤیەت بواری پەیوەندییەکی چاکی لەگەڵ یەکێك لە هێزە نێوەندییەکاندا بۆ هەڵدەکەوێت، ئیدی هێزە بەرهەڵستکارەکە بەلایەوە فت دەبێت. بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی،

وەکو زلهێزێك، جارجارە پێویستی بەو ئامێرو ئامرازو هێزانەش دەبێت. دیارە هەڵتەکاندن و نەخشەکێشانێکی نوێی ناوچەکەش لەبەرژەوەندییەتی.

بزووتنەوە نیشتمانییە ئازادیخوازەکان، کە زێتر ئاوازی سەربەخۆیی دەخوێنن، دەتوانرێت بکرێنە چێترین نموونە بۆ دەستنیشانکردنی سیاسەتی سۆڤیەت لەناوچەکەدا. ١٩٢٠ سۆڤیەت پشتگیریی لەدامەزراندنی دوو کۆماری ئازاد لە گیلان و ئەرمینیا کرد. یەکەمیان بە ئومێدی جێپێ بوونەوەیەك لای حوکومەتی نێوەندیی ئێران، کرایە قوچی قوربانیی. دووهەمیشیان حووتی دەوڵەتی سۆڤیەت هەڵیلووشی. ١٩٤٥ هەمدیسان سۆڤیەت پشتگیریی لە جووتە کۆماری سەربەخۆی ئازربایجان و کوردستان کرد. ئەوانیش پاشان بەهۆی پووچەڵیی سیاسەتی نەوتاوی سۆڤیەت خۆیی و بە زۆربۆهێنانی هێزە ڕۆژئاواییەکان ، بەدەردی ئەوانی دی چوون.

ئەورۆ بەهۆی برەوو جێپێ پەیداکردنی سۆڤیەتەوە و لەکزی و کەمیدانی توانای ڕۆژئاواوە لەناوچەکەد، ڕەنگە هەوڵی لەو بابەتە سەرکەوتووتر بێت ".

# پاشەکی و بەدووددا چوونێك

هەرلە چاپ و کۆپیکردنی ئەم کتێبولکەیە بوومەوە، دەمودەست دانەیەکم بە نەبەستراوی بۆ کاك فازڵ نارد. هێشتا خەریکی بەستنی ئەوچەند دانەیە بووم، کە بۆ بلاّوکردنەوەم ئامادە دەکردن، نامەیەکی کاك فازڵ گەیشتە دەستم. تکای لێکردبووم بلاّوکردنەوەی کتێبەکەم ڕابگرم و بواری ئەوەی بدەم هەندێك سەرنجی خۆی سەبارەت بە پێداچوونەوەکەم بنووسێت و لەگەڵ کتێبەکەی خۆمدا بۆی چاپ و بلاّوبکەمەوە.

هەرچەندە داوایەکی کەمێك سەخت بوو، چونکە نێزیکەی ۳۵ دانەیەکم بەدیاری بۆ دۆستانم و داو دەزگە کوردۆلۆژییەکان ناردبوو. بەستەیەکیشم بۆ برادەرێك ناردبوو، بۆم بلاّوبکاتەوە. ئەمە جگەلەوەی پێموابوو کە دەمەتەقێ و مشتومڕێکی برایانە و سوودبەخش، لەسەر ڕووپەڕی یەکێك لە بلاّوکراوە کوردییەکانی ئەورووپا درێژەی پێبدرێت، لەبارترە. بەلاّم نەبوونی بلاّوکراوەیەکی ئەوتۆ، کەبەردەوام بەڕێکوپێکی دەربچێت و نادڵنیاییم لەوەی داخۆ ئەو بلاّوکراوەیە، بەدەست خوێنەرانی ئەم کتێبولکەیە دەگات ؟ لەپاڵ ئەوەشدا بڕوای تەواوم بە ئازادیی ڕادەربڕین و ڕەخنە بۆسوودبێت نەك بۆ ڕەخنە، بڕیاری ئەوەی پێدام بلاّوکردنەوەی کتێبەکەم ڕاگرم و وەك ڕێگەم بەخۆم داوە بکەومە وێزەی کارنامەکەی کاك فازڵ، هەلودەرفەتێکی ئازاد بۆ ئەویش

برِەخسێنم کە بەریەرچم بداتەوە و لەسەرخۆبکاتەوە و هەڵەم بۆ هەڵگرێتەوە. بۆیە کاك فازڵم سەرپشك کرد، چۆن دڵی دەخوازێت بنووسێت و گفتی ئەوەشم دایە، کەهەرچی دەربارەی دەنووسێت ، ئەرکی چاپ و بلاوکردنەوەی دەگرمە ئەستۆ.

بەوبریارەم، مافێکم بەو دا و دەروازەی مافێکم لەسەرخۆم بەست، چونکە ئەوبەریەرچدانەوەیەی کاك فازڵ نووسیویە، گەرتەواوتەواو، وەکو پێویست هەڵیسەنگێنم و هەڵیتەکێنم و وەرامێکی ئەوتۆی خاڵ بە خاڵی بدەمەوە، کە خوێنەرلەهەردووکمان بگات ، ئەوا دەبێت هەمدیسان بیست تا سی لاپەرەی دیکە بنووسم، ئەوکاتە رەنگە ئەویش وەرامی هەبێت، یانی ئەم پاشکۆیە لەخوێنەر دەکەینە (مەتەڵۆکەی مێشێ) وکۆتایی نایەت، کە دیارە لەکتێبێکی ئاوهادا دەست نادات.

بۆیە ناچارم ئەو مافەی خۆم ژێرلێوخەم و دەقی وەرامەکەی کاك فازڵ هەروەك خۆی، بێ هیچ دەستکاری و راستکردنەوەیەکی زمانەوانی و رێنووسی بلاودەکەمەوە و هێندەی پێویست بێت تەلەگراف ئاسایی بەدەنگ دێم وخۆم روونەدەکەمەوە. تکاش لەخوێنەرانی بەرێز دەکەم دەقی ئەوخالانەی کاك فازڵ پێشچاوی خستوون لەگەڵ دەقی نووسینەکەی مندا بەووردی بەراورد بکەن، ئەو کاتە زۆر مەبەست ئاشکرا دەبن.

# چەند سەرنجێکی سەرپێیی
# لە پێداچوونەوەکەی کاك کوردۆ عەلی

کاکی بەڕێز کوردۆ عەلی، هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەیەکی ڕەخنەگرانەی بە کارنامەی دوکتۆراکەمدا بۆ ناردم، بەلاّم پاش ئەوەی لەچاپی دابوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ لەچاپدانی ئەم سەرنجانە، کە وەکو پاشکۆیەك لەگەڵ نووسینەکەی خۆیدا بلاّوی بکاتەوە، ئەوەش کارێکە شایانی تەقدیر و سوپاسە.

بێگومان ئەگەر نووسینەکەی کاك کوردۆم پێش لەچاپدانی ببینیایە دەمتوانی ووردتر و قووڵتر لە هەندێ خاڵی بکۆڵمەوە و چەند سەرنجێکی نوێی خۆم دەربارەی هەمان کارنامەی دوکتۆرا بخەمە سەری ، بەلاّم بەم پەلەیە کارێکی وا لەم پاشکۆیەدا جێی نابێتەوە، بۆیەکا تەنها هەندێ ڕوونکردنەوە دەخەمە پێشچاوی خوێنەرانی بەڕێز، کە ئەرکی تێگەیشتنی کارنامەکە و نووسینەکەی کاك کوردۆ ئاسانتر دەکات.

پێشەکی سوپاسی کاك کوردۆ دەکەم کە ئەوەندە بەووردی بەکارنامەکەمدا چۆتەوە و هەوڵیداوە بە خوێنەری کوردی بناسێنێت. لەڕاستیدا هەندێك کەموکوورپی کارنامەکەم لەخۆیشم شاردراوە نیە، وەکارنامەکە بەو شێوەیە ئامادەی بلاّوکردنەوە نیە و تەنها چەند کۆپییەکی پێشکەش بە دانیشگا کراوە. هەر لەو کاتەیشەوە خەریکی پیاچوونەوە و ڕێك و پێك کردنیم بەنیازی

لەچاپدانی وەکو کتێبێك (بەزمانی ئەڵمانی) کە هیوام وایە سەرەتای ساڵی داهاتوو بکەوێتە دەست خوێنەران. لە هەمان کات دا خەریکی ئامادەکردنی چاپی عارەبی کارەکەمم کە ئەویش تاکۆتایی ١٩٨٧ ئامادەی چاپ دەبێت.

دەتوانم هەڵسەنگاندنەکەی کاك کوردۆ بکەم بە سێ بەشەوە:

١-هەندێ ڕەخنەی بەجێ و ڕاستی لە کەم و کووڕیەکانی کارنامەکەم، کە وەکو وتم زۆربەیان لای خۆشم ئاشکران ولە نوسینەوەی سەر لەنوێی کتێبەکەم دا ڕەچاوم کردوون، لەگەڵ ئەوەشدا سوپاسی دەکەم کە سەرنجی بۆ هەندێ لایەن ڕاکێشام کە لەلای من ڕوون نەبوون، یا کەوتوومەتە هەڵەوە دەربارەیان، بەهۆی نەبوونی سەرچاوەی تەواوەوە.

٢-هەندێ ڕەخنە و پرسیاری کاك کوردۆ، کە دەگەڕێتەوە بۆ لەیەك نەگەیشتن، وە لێرەدا دەستنیشانیان دەکەم.

٣-هەندێ ڕەخنە و بیروڕای تر کە بەپێی زانیاری و بۆچوونی ئەو جۆرێکن، بەلاّم لە سنووری زانیاری من دا و بەپێی بۆچوونم جۆرێکی ترن. لێرەدا یان سەرچاوەکانمان جیاوازن (زانیاری هەرکەسێکیش سنووری هەیە)، وەیان بۆچوون و ڕوانگەی سیاسیمان جیاوازە، بۆیەکا ئەنجامی شیکردنەوەکانمان جیاواز دەردەچن.

بێگومان هەلێکی باش دەبوو ئەگەر بمانتوانیایە ئەو بۆچوونە سیاسییانەش یەکالاّ بکەینەوە و لەڕێی مشت و مڕێکی دۆستانەوە بیروڕاکانمان، کە پشت بەسەرچاوەی جیاواز دەبەستن، بخەینە بەردەم خوێنەران. بەلاّم چونکە بوارەکە تەسکە، وا لێرەدا بەکورتی هەندێ سەرنجی سەرپێیی دەنووسم کە

هیوادارم کارەکەی کاك کوردۆ ڕوونتر بکاتەوە. لەناو دووکەوانەشدا ژمارەی لاپەڕەی نوسینەکەی ئەو دەکەم ، کە ئەو مەسەلەیەی تێدا هاتووە.

## یەکەم : دەربارەی سەرچاوەکان :

١-وتارەکەی (ن. بێکەس: خیارات للسیاسه السوفیاتیه تجاه المساله الکردیه)، کە کاك کوردۆ دەپرسێت بۆچی ئیشارەتم بۆ نەکردووە.

هەمان تەرجومەی عەرەبی ئەووتارەیە کە کاك سیامەند زەید عوسمان، بەفەرەنسی و بە (فارسیش) بلاوی کردبۆوە و سوودێکی زۆرم لێ وەرگرتووە و ئیشارەتم بۆ کردووە (بنوارە کوردۆ، ل٣-٤)

٢-ئاگام لە کارنامەی دوکتۆراکەی (ولسن ناتالی هاول) هەیە. تەنانەت فۆتۆکۆپی هەندێ لاپەڕەشی گەیشتبووە دەستم، بەلاّم دەقی کارەکە کە داوام کردبوو زۆری خایاند تا گەیشتە دەستم و من لەبەشی هەرەزۆری کارنامەکەم بووبوومەوە و لەچاپم دابوو. بەلاّم لە پیاچوونەوەی نوێی کارەکەمدا و ئامادەکردنی وەکو کتێبێك، سودم لەو کارنامەیە وەرگرتووە و زانیارییەکانیم ڕەچاوکردووە ئیشارەم بۆ کردووە.

٣-پرسیارەکەی کاك کوردۆ دەربارەی ئەرشیفی تایبەتی خۆم و تەمەنم! کە دەلّێت : (ناگونجێ بیست سالّ خەباتی سیاسی کردبێت ئەگەر ١٩٥١ لەدایك بووبێت)، بەجێیە. بەلاّم ڕاستیەکەی وایە کەمن بەهۆی هەندێ گێرمە و کێشەی سیاسییەوە کە لێرەدا جێی باسکردنیان نیە، مێژووی لەدایك بوونم لە نەمسا بەهەلّە نوسراوە، (کە ئێستە خەریکی ڕاستکردنەوەیم).

لەڕاستیدا سەرەتای ١٩٤٨ لەدایك بووم، بەلاّم لە پێشکەشکردنی کارنامەکەم دا، ناچاربووم هەمان مێژووی لەدایك بوونم بنوسم کە لە پاسپۆرت و بەلگە شەخسییەکانم دا نوسراوە (١٩٥١). بەهۆی هەلگیرسانی شۆڕشی کوردەوە زۆربەی لاوانی ئەو سەردەمە زۆرزوو دەکەوتنە مەیدانی سیاسەتەوە. بەش بە حالّی خۆم، پایزو زستانی ١٩٦٣-١٩٦٤ م لە زیندان دا بەسەربرد، کە بیست سالّ لەمەوبەر زیاترە. (کوردۆ: ل٤).

٤-ئایا دوکتۆر کەمال فوئاد، کە یەکێکە لەو کەسانەی گفتوگۆم لەگەلّ ئەنجام داون و یارمەتییەکی زۆری داوم، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی بووە؟ (کوردۆ: ل٥)

لەڕاستیدا کاك کەمال فوئاد لەسەرەتای شۆڕشی کوردەوە، لەکاروباری پەیوەندییەکانی دەرەوەدا دەورێکی بالاّی هەبوو. لە کۆبوونەوەی ١٩٦٤/١٠/١١دا هەلّبژێردرا بە ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بە سەرۆکایەتی خوالێخۆشبوو بارزانی. دوای ئەوەش لەسالاّنی ١٩٦٧-١٩٧٠ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان – بالّی مەکتەبی سیاسی بوو.

تۆمارکردنی ئەم ڕاستییە مانای شەرعیەتدان بەلایەنێکی پارتی نییە. شۆڕشی کورد لە سالاّنی ١٩٦٤-١٩٧٠ تووشی دووبەرەکی و شەڕی براکوژی بوو و پارتی بووە دووبەشەوە. بەشێکی بەسەرکردایەتی بارزانی و ئەندامە سەرکردەییەکانی وەکو مامۆستایان د. مەحمود عوسمان، سامی ڕەحمان، نوری

شاوەیس، عەلی عەبدوڵلاّ. وە بەشێکی کە بەباڵی مەکتەبی سیاسی ناسراوە، بەسەرکردایەتی مامۆستایان ابراهیم احمد و جلال تاڵەبانی و عومەر مستەفا.

کارنامەی دوکتۆراکەی من جێی شیکردنەوەی شەرعیەت و ڕاستی و ناڕاستی لایەنێك نەبووە چونکە کارێکی وا لە سنوور و ئامانجی نوسینەکەی من بەدەربوو. (١)

٥-دەربارەی نامەکەی ژك بۆ بارزانی کە لەپاشکۆی نامەکەمدا بلاّومکردۆتەوە (کوردۆ: ل٧٣).

کاك کوردۆ دەڵێت کە بۆ یەکەم جار نەرمین ابوبکر لەگۆڤاری (دراسات کردیە)ی معهدی کوردی پاریس دا سەرەتای ١٩٨٥ بلاّوی کردۆتەوە. کارنامەکەی من پێش کۆتایی ١٩٨٤ تەواو بوو بوو وە درابووە دەست پرۆفیسۆرەکان بۆلێکۆڵینەوە و قبولّکردنی. ئینجا حوزەیرانی ١٩٨٥ بەڕەسمی پێشکەش کراوە و دوکتۆرایان داوەتێ. ئەو کەسانەی خەریکی کاری دوکتۆران دەزانن کە لەنێوان تەواوکردنی کارنامە و قبولّکردنی ڕەسمی دا، بەلای کەمەوە چەند مانگێکی پێدەچێت. بەهەرحاڵ بلاّوکردنەوەی نامەکە هیچ هونەرێکی منی تێدا نییە. منیش لەهەمان مەعهەدی کوردی پاریسەوە دەستم کەوتبوو وەك سیامەند عوسمان لەگەڵ هەندێ نووسینی بەکەڵکی تردا بۆی ناردم و نووسیبوشی کە لەژمارەی بەهاری گۆڤارەکەیان دا بلاّودەکرێتەوە. بەلاّم بەداخەوە ئاگام لە کتێبەکەی مامۆستا کەریمی حسامی نیە و تا ئێستە نەمدیوە، کە بێگومان بەکەڵك دەبێت بۆپێداچوونەوەی لەمەودوام.

٦-هەندێ سەرچاوە کە کاك کوردۆ ئیشارەتی بۆ دەکات و دەیانتوانی چەند لایەنێکی کارەکەم (بەتایبەت دەربارەی ئێران) ڕوونتر بکەنەوە، بەرچاوم نەکەوتوون و نەمتوانیوە سوودیان لێوەرگرم. وەك کتێبەکەی مامۆستا حسامی. هەروەها انورخامەای: فرصت بزرگ از دست رفته. عمیدی نوری: گدشته چراغ راه ایندا است. .... کە هیوام وایە پێش لە چاپدانی کتێبەکەم دەستم بکەون و سوودیان لێوەرگرم.

## دووهەم: هەندێ ڕوونکردنەوەی تر:

١-کاك کوردۆ (ل٨٦) دەڵێت کەلەکارنامەکەمدا ناوی (فیرقەی دیموکراتی ئاوربایجان) م بە پارتی دیموکراتی ئازربایجان هێناوە، منیش ئەزانم کە ناوی فیرقە بەفارسی و ئازەری وایە و لەناو کوردی خۆیشماندا هەر بە فیرقە ناسراوە، بەلاّم بەزمانی ئەڵەمانی هیچ ووشەیەکی گونجاوم بۆ فیرقە نەدۆزییەوە. دەبوو یا Partei Organisation بەکاربهێنم ئەگینا زیاتر سەر لەخوێنەری ئەلمانی دەشێوا . (٢)

٢-کاك کوردۆ (ل ٨٣)دەڵێت: کە حیزبی کۆمۆنیستی عیراق هەرگیز دانی بە مافی چارەنووسی کوردانەناوە. (٣)

لەڕاستیدا هەڵوێستی ئەم حیزبە تووشی گۆڕان و بادانەوەی زۆر بووە . لە ڕۆژنامەی (کفاح الشعب) ی ساڵی ١٩٣٥ دا فەهد داوای سەربەخۆیی کوردستان دەکات. لەژمارەی تشرینی دووهەمی ١٩٤٥ ی القاعدە ، دوای کۆنگرەی حیزب هەمان فەهد بە ئاشکرا مافی دیاری کردنی چارەنوسی کورد دەسەلمێنێت. بەلاّم حیزب لە پەنجاکاندا ، بەتایبەت دوای ١٩٥٨ سیاسەتێکی ناڕاستی بەرامبەر مەسەلەی نەتەوەیی کورد گرتەبەر، کە بەدرێژی لەکارنامەکەمدا شیکراوەتەوە و ڕەخنەی لێگیراوە.

٣-سـەردانی نهێنـی مامۆسـتا جـەلال تاڵـەبانی بـۆ مۆسـكۆ(١٩٦٣)، پێچەوانەی بلاوكردنـەوەی گفتوگۆكـەی نییـە لـە ڕادوێـی مۆسـكۆوە (كـوردۆ:ل ١١٤).

ئـەو دوو مەسـەلەیە لـە دوو سەرچـاوەی جیـاوە وەرگـیراون و ئیـشارەتیان بـۆكراوە. سـەردانی نهێنـی مانـای سـەردانی ناڕەسمییە كـە دەوڵەتەكـە بـلاوی ناكاتـەوە. گفتوگـۆ لـە ڕادوێ بلاوكردنـەوەش مانـای ئەوەنییـە كـە ئەوكەسـە لەهەمان كـات دا لـەو وولاتەیە، یاخود بەڕەسمی لەو وولاتەیە.

٤-دەربارەی ڕادەی سەربەخۆیی حیزبە كۆمۆنیستەكان (كوردۆ: ل١٢٦)

من بەدرێـژی باسی دەسـەلاتی شوورەوی و كلكایـەتی ئـەو حیزبانـەم كـردووە. بـەلاّم هەنـدێ جـار ئـەو ناسـەربەخۆییە بـێ سنوور نـەبووە و ناوبـەناو جیـاوازی هەڵوێست تێبینی كـراوە لـەنێوان شوورەوی و ئـەو حیزبانـەدا، وەك نیشانم داوە. دەبێـت ڕەخنـە لـە كلكایـەتی ئـەو حیزبانـە بگیرێـت، بـەلاّم ئـەو حیزبانـە و كۆمینتێرن و كۆمینفۆرم وەكو داردەستی شوورەوی و یـان دەسگای جاسوسی لەقەڵەم دان، كارێكی نازانستییە و لـەگەڵ هەندێ ڕاستی مێژوو دا ناگونجێت. (٤)

٥-كـاك كـوردۆ بـێ بەڵگـە لەسـەر هەنـدێ شـتی نووسـیوە كـە بـەلای منـەوە كەوتۆتـە هەڵـەوە. بـۆ نموونـە (كـوردۆ:ل ٩٧) دەڵێـت: ئـەو دوكتـۆر جەلالـەی لەكۆتـایی شەستەكـان دا لـە كوردستـانی ئێران و عیراق بوو، پیـاوی سـاواك بـووە و نـاوی ڕاستەقینەی (هـاشمی شـیرازی)یـە. لەڕاسـتیدا نـاوی ڕاسـتی دوكتـۆر جەلال (كۆرشی لاشائی) بوو. ئەوسا ماركسییەكی ناودار و چالاكی ئێرانی بوو

لـه ئـەڵمانیا. ئینجـا لـەكاتی ڕاپەڕینەكـەی شـەهیدان سـولەیمانی مـوعینی (فـائق) و مـەلا ئـاواره و شـەریف زادەدا بەكوردسـتـانی عـیراق دا چـووه كوردستانی ئێران و پاش شكانی ڕاپەڕینەكە گەڕایەوە ئەمدیو. (٥)

سێهەم: چەند سەرنجێكی بنەڕەتی تر:

بەشی زۆری نووسینەكەی كـاك كـوردۆ، پیاچـوونەوە و بـەكوردی داڕشتنی كارنامەكـەی منـە، كەجێگـەی سوپاسـە، بـەلاّم لـەزۆر شـوێن دا دیارنییە كامـە قـسەی منـە و كامـە هەڵـسەنگاندن و بـیر و ڕای خۆیـەتی. باشـتر وابـوو دەقـی نووسینەكانی من لەناو دوو كەواندا لەسەرنجەكانی خۆی جیابكاتەوە. (٦)

٢-كاك كوردۆ ڕەخنەم لێ دەگرێت كە لەگەڵ هەندێ سەركردە و لێپرسراوی كـوردا گفتوگـۆم كـردووه كـە جێگـەی متمانـە نـین و دەوریـان بـووه لـەڕوخان و شكانی شۆڕشـدا. لەڕوانگـەی كـارێكی زانستییەوەئەم دووشتە جیـان. گفتوگـۆ لەگەڵ ئەو بەڕێزانەدا مانـای هەڵسەنگاندنی دەوری سیاسییان نیە. ئامـانجی كارنـامەكـەی مـن لێكۆڵینـەوەی پەیوەنـدی كـورد و شـوورەوییە لەچوارچـێوەی سیاسـەتی جیهـانی و نـاوچـەییدا. بـۆ باسێكی واش كـە سەرچـاوەی نوسـراوی كەمـە، لەگـەڵ كـێ دەتوانرێـت گفتوگـۆ بكرێـت جگـە لـەو كەسـانە، كەهەریەكـەیان بـەجۆرێك و لـەكاتێك دا ئاگـاداری پەیوەندیـەكانی دەرەوەی شۆڕش بوون. (٧)

بێگومـان لەهەنـدێ قـسەكانیـان دا، بـەپێی بۆچـوون و بەرژەوەنـدی سیاسـی خۆیـان قـسەدەكەن و هەوڵـدەدەن خۆیـان ڕاسـت و نـاحـەزەكانیان نـاڕاسـت، خۆیـان چەپ و ئەوانی تر ڕاسـت لەقەڵەم بدەن. من هەوڵمداوە خۆم لـەو گێژاو

و (شەڕ بەکۆنە قین)ە لادەم و تەنیا جەوهەری قسەکان وەرگرم کە پەیوەندیان بەباسەکەمەوە هەیە. بەڵام چ سەرچاوەیەك، چ کتێب و وتارنووسێك هەوڵ نادات بەپێی بۆچوونی خۆی بنووسێت؟

کەچی دەبینی کاك کوردۆ بۆ بەرپەرچدانەوەی هەندێ لەو زانیاریانە پشت بە مامۆستا هەژاری موکریانی دەبەستێت، کە لە پێشەکی شاکارەکەی دا (شەرەفنامە) ئەویش بەپێی هەڵوێستی خۆی هۆیەکانی ناکۆکی ١٩٦٤ لێکدەداتەوە و کەسانێك گوناهبار دەکات. (٨) بێگومان نووسینەکەی ئەویش جیاناکرێتەوە لەهەڵوێستی و شوێنی دیاری مامۆستا هەژار لەو کاتەدا. (کوردۆ: ل٩١-٩٢)

یا بۆ بەڵگەی جاسوسبوونی د. مراد ڕەزم ئاوەر، پشت بە ڕاپۆرتێکی عەلی قازی دەبەستێت بۆ دەسگای جاسوسی ئەمریکا، کەدیسان بەڵگەیەکی بێ هێزە و ئامانجە سیاسییەکانی ڕۆشنن. (٩)

لەوەش بگەڕێتەوە کاك کوردۆ لەچەند شوێنێکدا پشت بەنووسینێکی نەناسراو دەبەستێت، کەخۆی ناوی دەبات بەکتێبێکی بێ ناونیشان. (١٠) (کوردۆ: ل٩٨)، ئەگەر دەزانێت سەروبنی ئەو کتێبە چییە و کێ نووسیویەتی، دەبوو ئاشکرای بکات. ئەگینا نووسینێکی بێ ناونیشان لەڕووی زانستییەوە بەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو نادرێتە قەڵەم.

٢-گلەییەکی دۆستانە:

کاك کوردۆ لەبەشی زۆری نووسینەکەیدا بەشێوەیەکی زانستییانە بەکارنامەکەدا چۆتەوە و بیر و ڕای خۆی دەربڕیوە، بەڵام لەهەندێ شوێنی تردا

بیروڕای سیاسی (وەڕەنگە حیزبیی) خۆی تێکەڵکردووە و بەشێوەیەکی ڕەق و بیّ ئەمان هێرش دەباتە سەرهەندێك سەرکردە و خەباتکەری کورد. لە نووسینەکەی کاك کوردۆ دا مامۆستا برایم ئەحمەد نابوت بووە (ل ١٠٦)، مامۆستا محەمەد مەحمود عبدالرحمن (سامی) دۆستی (١٢) ئەشەربن ناتانە و لە ئیسرائیل بووە، (ل ١٠٦). مامۆستا کەریم ئەحمەد خرەی ئاجیل و زرەی تمەن لەگیرفانی دێت (١٣) . بارزانی ساڵی ١٩٧٥ ئازایەتی ساڵێك لەوەبەری نەمابوو (ل ١١١). ئەم جۆرە سوککردنەی هەندێ سەرکردەی سیاسی کورد، لەسنووری لێکۆڵینەوەی زانستی دەردەچن و نرخی نووسینەکەی کاك کوردۆ کەمدەکەنەوە.

هەر لەسەرۆکی خوالێخۆشبوو بارزانییەوە تا ئەوانی تر، لێپرسراوی هەندێ هەڵەی سیاسی گەورەن، کەهەقە شیبکرێنەوە و ڕەخنەشیان لێبگیرێت. بەلاّم دەبێت دەوری ئەو سەرکردانە بە تەرازوویەکی عادلانە بکێشین، کارەکانیان وەکو هەڵەی سیاسی تێبگەین ، نەك وەکو خیانەت و خۆفرۆشی، وە هەرگیز بە شکان و نابوتییان خۆش نەبین. هەر یەکێك لەو زاتانە (بەڕادە و شێوەیەکی جیا) عومرێکیان لەخزمەتی ئەم گەلەدا بەسەربردووە . هەندێکیان ڕەمزی بزووتنەوە و بوونی گەلەکەمان بوون، وە بەپێوانەی زروف و دەوری خۆیان، لەکەڵە سەرکردەی وولاّتانی تر کەمیان نییە. سوککردنیان ناهومێدی و بێباوەڕی بلاّودەکاتەوە . ئەگەر وا بێرەحمانە حوکم بەسەر ئەو کەسانەدا بدەین، ئایا بەهەمان پێوانە (پەیوەندیی بەدەرەوە، پشتبەستن بەدەرەوە، نوقومبوون لەتاکتیکدا، ناکۆکی ناوخۆ و خۆخۆیی . . . . .) ناتوانرێت مێژووی

سەرکردە ناودارەکانی کۆنیشمان (وەك شێخ عوبەیدوڵڵا و قازی محەمەد و شێخ مەحمود) ڕەشبکرێنەوە؟

ڕەفتار و سیاسەتی سەرکردەکانی کورد هەرلەکۆنەوە تا ئێستا، لەو بارە دژوار و سەختەی کوردی بەدبەخت جیاناکرێتەوە، کە لە گێژاوی سەختی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا، خەریکی پەلەکوتێی مان و نەمانێتی. بێئەوەی پاکانە بۆ کەس بکەین، دەبێت بیسەلمێنین کە بەشێك لەهۆکانی ئەو هەڵە کوشندانە خۆی لە خۆیدا، لەو بارە دژوارەدایە کە کوردی دابەشکراوی تێدایە.

دوا وتە:

جارێکی تریش سوپاسی کاکی بەڕێز کوردۆ عەلی دەکەم، کەبە سنگێکی فراوانەوە ئەم سەرنجانە لە پاشکۆی نووسینەکەی خۆیدا بلاودەکاتەوە، ئەگەرچی ڕەنگە لەگەڵ بۆچوونی خۆیدا یەك نەبن.

فازڵ مەلا مەحمود ڕەسوڵ

١٩٨٦/١٠/٢٣

ڤیەننا

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:


١-جەمال نەبەز: "کوردستان و شۆڕشەکەی"، بنکەی چاپەمەنیی ئازاد، ستۆکهۆڵم، ١٩٨٥. (کوردۆ عەلی لە ئاڵەمانییەوە کردوویە بەکوردی).

2. Wilson N. Hawell: The Soviet Union and the Kurds. University of Virginia, 1965

٣-دەبایە پێنج پارچەی نووسیبا، چونکە خۆی لەچەند جێیەك دا باسی پارچەیەکی بەرتەسکی شوورەویش دەکات.

٤-"لاکردنەوەیەکی کوردانە بەلای شۆڕشی ئەیلول دا"، گۆڤاری "ڕوانگەی ئازاد"، ژ ٢ ، مارتی ١٩٨١، ل٢٥.

٥-"٤٥ عاما من النضال فی سبیل وطن حر و شعب سعید"، ص٣٤ ، من منشورات الحزب الشیوعی العراقی، ١٩٧٩ .

٦-لینین : "حرکة شعوب الشرق الوطنیة التحرریة"، دار التقدم، موسکو ، سنة الطبع، بلا، ص ١٧٤ .

٧-هەمان سەرچاوە، ل ١٧٩ .

٨-هەمان سەرچاوە، ل٢٧٥ .

٩-هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٠ .

١٠-هەمان سەرچاوە، ل ٣١٨ .

١١-ڕەزاخان بەپرس و ڕای ئینگلیز کودەتاکەی بەسەر قاجارەکاندا کرد.

بڕوانە:

Gerard de Villiers: "Der Schah", Heyne Verlag, Munchen, 1979, S.7.

١٢-جەمال نەبەز: "بیری نەتەوەیی كوردی"، بنكەی چاپەمەنی ئازاد، ستۆكهۆلم، ١٩٨٤، ل ١١٦ .

١٣-هەمان سەرچاوە، ل ٩٠ .

١٤-ب. هەندرێن: "كامیل ژیرو هۆنراوەی نەتەوەیی لەهەڵوێست و ڕەخنەدا"، چاپخانەی ئۆفسێتی مینا، بەغدا، ١٩٨٥، ل٣٢.

١٥-لێرەدا باشتربوو نووسیبای "كودەتاكەی شەواف" ، چونكە بۆ بێگانە و كەسانی ناشارەزا ڕوون نییە كام كودەتایە مەبەستە.

١٦-پارتی كۆمۆنیستی عێراق لەبەیاننامەیەكی نێوەڕاستی ئەیلولی ١٩٦٤ دا، داوا لە گەلی عێراق دەكات بۆ (یەكێتی عارەب) و (ئازادیی) و (سۆسیالیزم) خەبات بكەن. یانی بۆ دروشمە سێ كوچكەكەی بەعسی ڕەگەزپەرست.

بڕوانە: جەمال نەبەز: " كوردستان و شۆڕشەكەی"، ل٢٤٢ .

١٧-دكتر انور خامەای: "فرصت بزرگ از دست رفته"، انتشارات هفته، تهران، ١٣٦٢، ص ٢٣٢.

١٨-د. ماهر الشريف: "فلسطين والمشرق العربي في نقاشات المؤتمر العالم السابع للاممية الشيوعية"، مجلة الثقافة الجديدة، العدد ١٢٥، تشرين الاول ١٩٨٠، ص ٢٣-٤٢.

١٩-محمد رضا پهلوی: "پاسخ به تاريخ"، انتشارات كی. وی. سی. لندن، ص ٥٧، ساڵی چاپی لەسەرنییە.

٢٠-دکترانور خامەای: "فرصت بزرگ از دست رفته"، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٩٣ .

٢١-سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٤-٢٧٥ .

٢٢-هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧-١٨ .

23. Gerard de Villiers: " Der Schah", S. 149.

٢٤-دکترانور خامەای: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨ .

25. Gerard de Villiers: "Der Schah", S.160-161.

هەروەها بڕوانە: محمد رضا پهلوی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٧ .

٢٦-دکترانور خامەای: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٣٤-١٤٧.

٢٧-عەمیدی نوری: "گدشته چراغ راه ایندەست" ، انتشارات جامی، ص ٣٣٨ .

٢٨-ابوالحسن تفرشیان: "قیام افسران خراسان"، تهران، ١٩٧٩، ص٧٧ .

٢٩-کریس کوچرا: "کردستان و جمهوری مهاباد"، ترجمه ناهید بهمن پور، شهریور ماه ١٣٦٠، ص ٣٤-٣٥ .

٣٠-دکترانور خامەای: "پنجاه نفر و سه نفر"، تهران، چاپ چهارم، مهر ١٣٤٣، ص ٨٤-٨٦ .

هەروەها بڕوانە: دکتر هوشنگ نهاوندی: " ٦٦ سال در خدمت موسکو"، کیهان چاپ لندن، شماره ٩١، ١٤ فروردین ١٣٦٥.

٣١-دکترانور خامەای: " پنجاه نفر و سه نفر"، ص١٧٣ .

٣٢-دکترانور خامەای: " فرصت بزرگ از دست رفته"، ص ٢٢٢-٢٢٤ .

٣٣-کریس کوچرا: "کردستان و جمهوری مهاباد"، ص٧ .

٣٤-هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠ .

٣٥-ابوالحسن تفرشیان: "قیام افسران خراسان"، ص ٧٥ .

٣٦-مەبەستی نووسەر بزووتنەوەی نیشتمانیی کوردەکانی سۆڤیەت نییە، بەڵکە مەبەستی جموجۆڵی کوردە پەنابەرە عێراقییەکانی سۆڤیەتە.

٣٧-نرمین ابوبکر: "وثائق من الارشيف البريطاني"، مجلة الدراسات الكردية، العدد ١-٢ ، السنة الثانية، كانون الثاني ١٩٨٥، ص٥٥-٦٠ .

هەروەها بڕوانە: کەریمی حسامی: "کۆماری دیموکراتی کوردستان، یان خودموختاری؟"، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوید، چاپی دووهەم، ١٩٨٦، ل ٤٥-٤٦ . هەرچەندە ساڵی چاپی یەکەمی لەسەر نییە، بەڵام بەدووری نازانم کە بەر لە ١٩٨٥ نەبێت. دەبێت ئەوەش بڵێم کە مامۆستا حسامی، هەڵەیەکی چاپی لەو نامەیەدا لێبۆتە گرێکوێرە و دەڵێت ڕەنگە ڕەمزێکی خۆیان بێت! ئەوە ڕەمز نییە، ووشەی (هەیئەتێ)کە کە بەهەڵە (هەئلن تێ) نوسراوە.

٣٨-دوکتۆر مراد، فەرمانبەرێکی دەزگەی جاسوسیی شوورەوی ك. گ. ب. یە. هەمان ئەو کەسەیە کە عەلی قازی لە ڕاپۆرتی ٥ ی مهری ١٣٥٨ یدا بۆ (سی. ئای. ئەی) دەربارەی دەنووسێت: "٢-گرنگترین کەسێك لەبواری مەسەلەی کوردی عێراقدا، نەفەرێکە کە هێندە ناسراو نییە، نێوی دوکتۆر مراد عەزیزە کە لە . . . . . . دەژی و هەمیشە بە پشتیوانیی ٢ مەرسیدس کە پڕن لەپاسەوانانی چەکدار بە چەکی ئۆتۆماتیك، هاتوچۆ دەکات. پلەی ئەو لە پێوەندیی بە دەوڵەتی عێراقەوە ئاشکرا نییە . . . . . . لەو ڕێزەوە کە لێیدەگیرێت ، وا پێدەچێت کە پلەیەکی باڵای هەبێت. لەماوەی ٤٦- ( . . . . . . )١٩ دا دوکتۆر

عەزیز لە ئازربایجان بەنێوی گروهبان مراد ڕەزم ئاوەری ئەرتەشی ئێران ناسرابوو، کە بۆ کۆماری کەم تەمەنی کوردستان کاری دەکرد. پاش ڕوخاندنی کۆمارەکە بۆ . . . . . هەڵهات و تا ئەو کاتەی لە بەغدا بەنێوی دوکتۆر عەزیزەوە خۆی نیشاندایەوە، هیچ زانیارییەك دەربارەی ئەو لەبەردەستدا نەبوو). بڕوانە: "اسناد لانه جاسوسی ایران"، کردستان ۲، شماره ۳۲، دانشجویان مسلمان پیرو خص امام، ص٦٦.

٣٩- بڕوانە: "٤٥ عاما من النضال فی سبیل وطن حر وشعب سعید" سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤.

٤٠-جەمال نەبەز: "کوردستان و شۆڕشەکەی" ، ل١٨٣ .

٤١-جەمال نەبەز: هەمان سەرچاوە ، پەراوێزی ل ١٢٨.

هەروەها بڕوانە : کەریمی حسامی: "کۆماری دیموکراتی کوردستان"، ل ٩٢.

٤٢-هەژاری موکریانی: "شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی"، چاپی دووهەم، تاران، ١٩٨١، ئەو پاشکۆیەی بەنێوی (لەشوێن چوونێك)ەوە خراوەتە سەرچاپی دووهەم ، ل٨٥٤-٨٥٥.

٤٣-هەژاری موکریانی: " شەرەفنامە، ل٨٥٥ .

44.Gunter Deschner: "Saladins Sohne, Munchen, 1983, Droemer Knaur Verlag, S. 289-291.

٤٥-سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٨ .

٤٦-لێرەدا نووسەر بازدی بەسەر قۆناغێکی گرنگی مێژووی پارتی کۆمۆنیستی عێراقدا داوە، ئەویش سەردەمی سکرتێرێتی بەهادین نوریبا (باسم)(١٩٥١-١٩٥٤). وەکو لە ل٨٣ دا ڕوونمانکردەوە، لەپرۆگرامەکەی ئەود

دان بە مافی چارەنووسی کورددا نرابوو، ڕەخنە لە پرۆگرامەکەی فەهد دەگرێت کە دانی بەو مافەی کورددا نەنابوو، هەڵوێستی پێشینی پارتی کۆمۆنیستی بە (ئۆپۆرتونیستانە) هەڵسەنگاندبوو.

٤٧-لێرەدا دەبێت بەشداریی کۆمۆنیست لە گەورەترین و دڕندانەترین تاوانی مێژوودا وەبیرخوێنەر بهێنمەوە، تاوانێك کە لەبیرچوونەوەی هێجگار دژوارە. لەگەورەترین کارەساتی دڵتەزێنی خواروری کوردستاندا، لەوکاتەدا کە ڕژێمە ڕەگەزپەرست و خوێنڕێژە هاوبەرەکەی کۆمۆنیستی عێراق، لەگوندەکانی سەرسنووری کوردستاندا شوێنەواری ژیاری مرۆڤایەتی کوێردەکردەوە، گوندی خاپوور دەکرد و ڕەز و باخ و شینایی لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵدەکەند و هەڵیدەپڕوکاند، کانیاوی کوێردەکردەوە و پاڵەی ڕەش و ڕووت و لەپ قڵیشاوی کوردی لەمەفتەن و خاکی باب و باپیرانیان بەدەردەنا، ئالەو کۆستە گەورەیەی کورددا، هاوڕێ موکەرەم تاڵەبانی، لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری ڕۆژی کوردستانەوە پیرۆزبایی لەو هەنگاوە شۆڕشگێڕ و سۆسیالیستانەیەی ڕژێم دەکرد و دەیفەرموو: "دەستی ئیمپریالیزم و بەکرێگیراوانی لەناوچەکە دەبڕێت".

٤٨-عەبدولصەمەد کامبەخشی کۆنە سکرتێری تودە دەنووسێت: " هەر لەسەرەتاوە مەسەلەی هەڵسوکەوت لەگەڵ ڕەزاشا دا، لەنێو حیزبدا پێشچاو دەخرا و دەمەتەقێی زۆری لەبارەوە دەکرا. زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی حیزب، وەکو کەسێك تێیاندەڕوانی کە لەنێوجەرگەی جەماوەرەوە سەریهەڵداوە و وەکو کەسێکی نیشتمانپەروەری دژ بە ئیمپریالیزم تێیاندەڕوانی. هەڵوێستی ئەوکاتەی حیزب بەرامبەر ڕەزاخان لەسەر ڕوویەڕی ڕۆژنامەکانی

حیزب بە ڕاشکاوی ڕەنگدەداتەوە، وەك كەسێك تێیاندەڕوانی كەدەستی بەكرێگیراوانی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی بریوە، هەوڵی بەهێزكردنی حوكومەتی مەركەزیی دەدات و ڕێگە لە هێزە پێشكەوتنخوازەكان و كۆمۆنیست نابەستێتەوە. بۆیە سەركردایەتی حیزب لەكارەكانی ڕازیبووو لەسەر ڕووپەڕەكانی ڕۆژنامەی (حقیقت) ی حیزبدا شیعریان پێدا هەڵدەگوت و دەیاننوسی: (من ڕەزا و تۆ ڕەزا، میللەتی ئێران ڕەزا). بڕوانە:

عبدالصمد كامبخش: "نصری به جنبش كارگری و كمونیستی در ایران"، انتشارات حزب توده ایران، چاپخانه زالتس لاند، ۱۹۷۲، ص ۳۲-۳۳.

## چەندسەرنجێك سەبارەت بە پاشكۆكە:

١-تكایە بڕوانە ل٤-٥، بزانە داخۆ من داوای ئەوەم لە كاك فازڵ كردووە؟ یاخود پرسیومە بۆ لەنێو ئەو هەموو پرسپێكراوانەدا تەنها ساڵەكانی ئەندامێتی كۆمیتەی نێوەندیی كاك كەمال نەنوسراوە؟

٢-ئێستا لە فەرهەنگم ڕوانی و دیتم بەڵگەكەی بەجێیە و ڕەخنەكەی من پووچدەكاتەوە.

٣-تكایە بڕوانە ل٨٢-٨٣، من ووشەی (هەرگیز)م هەرگیزا و هەرگیز بەكار نەهێناوە، چونكە واتایەكی ڕەهای هەیە، بەڵكە نووسیومە: "وەك كاك فازڵ دەڵێت: پارتی كۆمۆنیست هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە.....".

بەڵگەكانیشم دوو سەرچاوەی پارتی كۆمۆنیست خۆیەتی.

٤-من هیچ جوداوازییەك لەنێوان (كلكایەتی) و (داردەستی) دا نابینم، پێموایە (كلكایەتی) ماناكەی لە (داردەستی) درێوترە. جگەلەوە ئەو حیزبانە و كۆمێنتێرنم بە دەستگای جاسوسی لەقەڵەم نەداوە، بەڵكە نووسیومە: "ستالین كۆمێنتێرنی هەڵوەشاندەوە و دەزگەیەكی جاسوسی بەنێوی كۆمینفۆرمەوەی لەجێگە دانا". بڕوانە ل٣٧ ی نووسینەكەم.

٥-ئەو زانیاریانەم لە كۆنە كاربەدەستێكی ڕۆژنامەی (النور) وەرگرتووە، كە ئاگاداری هەندێك لەو پەتبازییانە بوو.

٦-ڕەخنەیەكی پەسەندە، ئەو هەڵەیەم لەچەند نووسینێكی پێشتریشدا كردووە.

٧-كاك فازڵ یا خۆی هەڵدەكات، یاخود لێم حاڵی نەبووە. من ڕەخنەم لەو نەگرتووە، بەڵكە ڕەخنەم لەو فیشاڵبازانەگرتووە، كە ڕاستییەكان لەو میللەتە دەشارنەوە و شەشی لێدەكەنە بێش. ئەوەتا دێرێك پاشتر كاك فازڵ خۆیشی پێ لەوەدەنێت.

٨- جارێ لەپێشەكی شەرەفنامەدا نییە، بەڵكە لە پاشەكییەكەیدا یە. ئەوجا ئەو گەواهییە تۆماركراوانەی مامۆستا هەژار سەرچاوەیەكی باوەڕپێكراون هەتا ئەو كاتەی ئەو مامۆستا گوناهباركراوانە بەبەڵگەی ڕوون و ڕازیكەر ئەو بوختانانە هەڵدەوەشێننەوە.

٩-ئەوەتەی من لە ڕیزی بزووتنەوەی كوردایەتیدا چاوم هەڵهێناوە، بیستوومە كە (دوكتۆر موراد ڕەزمئاوەر) كاربەدەستێكی دەزگەی جاسووسیی شوورەوییە. من تەنها پشتم بەو ڕاپۆرتەی عەلی قازی و بیستنەكانی خۆم نەبەستووە، بەڵكە بەو بەڵگانەش پشتئەستوور بووم كە كاك فازڵ لە ل٣٥٢ ی كارنامەكەیدا پێشچاویخستوون. ئەوەتا خۆی دەنووسێت: "هەرچەندە ئاشكراكردنی جموجۆڵەكانی دەستگای جاسوسیی شوورەوی لەچوارچێوەی ئەم كتێبەی ئێمەدا جێینابێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێشچاوخستنی هەندێك ڕووداوی زەقی ئەو پەلەقاژە نهێنییانە، بێسوود نابێت.....".

ئەوجا دوو نموونەمان بۆ دەهێنێتەوە، یەكێكیان (عەلی گەلاوێژ)ە كە دەنووسێت: "خۆی لەبەرنامەیەكی تەلەفزۆنیدا، دانی بەوەدا نا كەخۆی و هەندێكی دیكە بەكرێگیراوی دەزگەی جاسووسیی شوورەوی بوون". (هەڵبەت

مەبەستی دانپێدانان وپاکانە بێتامەکانی سەرکردەکانی تودەیە لە تەلەفزیۆنی ئێراندا ).

ئەوی دیکە (دوکتۆر موراد عەزیز)ە ، باسی ئەو ئەرکە نهێنییە گرنگانە دەکات کە لەلایەن شوورەوییەوە پێسپێردراوە. باشە ئەم کابرایە کە هیچکات بەڕەسمیی تودەیی نەبووە، دەبێت چ بووبێت وا سۆڤیەت هێند متمانەی پێکردبێت و ئەو ئەرکە مەزنانەی پێسپاردبێت؟ تا لەو ڕێگەیەدا سەریشی تێداچوو.

پێدەچێت کاك فازڵ لەیادی کردبێت کەخۆی مەسەلەیەکی ئاوهای هوروژاندووە، بۆیە ئەو زانیارییەی من، بە (بەڵگەیەکی بێهێز) و ئامانجە سیاسیەکانیشم بە (ڕۆشن) لەقەڵەم دەدات!

١٠-جارێ من بەهیچ جۆر باسی (کتێب)م نەکردووە، بەڵکە گوتوومە (نووسینێك)، ئەویش نووسینێکی چاپکراوی شێزدە لاپەڕەیی فولسکابە دەربارەی دووبەرەکیی ڕیزەکانی پارت نووسراوە و دۆستێکم بۆی ناردووم و نووسیویوە تکایە تەنها بۆ سوودلێوەرگرتنی خۆتە.

ئەوجا کە چاوپێکەوتن و ڕاوەرگرتنی چەندین کەسانی شاردراوە و نادیارو نەناسراو بۆ کارنامەی دوکتۆرایەك لەڕووی زانستییەوە بەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو لەقەڵەم بدرێت ، ئەوا سەرچاوەیەکی بێنێو بۆ نووسینێکی ڕەشۆکی وەك ئەمەی من نابێتە عەیبەیەکی ئەوتۆ.

١١-کاکە فازڵ چاکی بۆچووە، من لە هیچ نووسینێکمدا بیرو ڕای سیاسی خۆم فەرامۆش ناکەم و تەنها لەو پێناوەشدا دەنووسم . من لە کلاوڕۆژنەی

بەرژەوەنـدیی کـوردەوە لـەبوون و ژیـان دەڕوانم. بۆیـە گـشت پێـشهاتێك بـەو کێـشانەیە پێوانەدەکـەم . مـن زۆر بـەخۆدەنازم و شـانازی بـەوەوە دەکـەم کـە هەڵگری بیری نەتەوەییم و نەتەوەکەی خۆم تاسەر مۆخ و ئێسقانم خۆشدەوێت. نەتەوەییەکم کە لە دەلاقەی برین و زامی کوردەوە شریخە و چەخماخەی ئازار و ژانی گشت میللەتانی زۆرلێکراو و مافپێشێلکراوی هاودەردم دەبینم. هەر ئەو باوەڕەشمە کردوومیە دەروێشی ڕاستی و هەرچی بەڕاست بزانم دەیڵێم و چ باکێکم لە گلە و گازندەی کەسیش نییە.

جگەلەوە کاك فازڵ خۆی هەر لەم پاشکۆیەدا لە ل١٥٣ دا، ئەوەی کردۆتە یاسـایەکی گـشتیی و دەڵێـت: "چ سەرچـاوەیەك ، چ کتێـب و ووتارنووسـێك هەوڵنادات بەپێی بۆچوونی خۆی بنووسێت"؟

کەواتە منیش ئەو مافەم دەکەوێت و کارێکی نابەجێم نەکردووە. بەڵام کـاك فـازڵ لـەوەدا زۆر بەهەڵـەدا چووە کە نووسیویە: " ڕەنگە بیروڕای حیزبیی خۆی تێکەڵ کردبێت". ئەگەر بەلای منەوە نەیکردایە پاکانە نووسین، ئەوا دەمتوانی بەبەڵگـەوە بـۆی ڕوونبکەمـەوە کـە گومانەکـەی چـەندە بێجێیـە. ئەوانـەی دەمناسـن دەزانـن ئـەو حوکمـە چـەندە نـاڕەوا و دوور لەڕاسـتییە. حیـزب بـەلای منـەوە هەمیـشە ئـامراز بـووە، نـەك ئامـانج. ئەوانـەی ئـەو هەڵەیـە دەکـەن و جێگۆڕکێ بە ئامراز و ئامـانج دەکەن ، ئومێدی هیچ خزمەتێکیان لێناکرێـت . زەلیلترین کەسانیش ئەوانەن کە لە قاوغ بۆشیی خۆیان (دەبنە ئەشکەوت و تەنها دەنگی حیزبەکەیان دەدەنەوە). جگەلەوە من دەتوانم لەو شاکارەی کـاك فازڵ دا دەیان بەڵگە پێشچاو بخەم کەنەك بیر و ڕای سیاسی، بەڵکە سۆزێکی

پەتی جلەوکێشی خەیاڵی بووە. ئەگەر چارشێو لابردن لەسەر هەندێك هەڵە و هەڵوێست سووکایەتی بەسەرشانی کەسێکدا بهێنێت ، ئەوا تاوانی ڕاستیبێژ نییە، بەڵکە تاوانی خاوەن هەڵوێستە هەڵەکە خۆیەتی. مێژووش ئەوەیە کە ڕوویداوە ، ئەوەنییە کە ئێمە ئاواتەخوازین ڕوویدابا.

زۆر بەداخەوە ئەمە باسێکی هێجگار بەرفراوان و بەتام و چێژە و ناتوانم لەم پەراوێزەدا جێیبکەمەوە . دیارە باری سەرنجی من و کاك فازڵ لەزۆر لایەنەوە تەواو لێکجوداوازن. ئەگەر کرا لەکاتێکی دیدا دێینەوە سەر ئەم باسە.

١٢-ووشەی دۆستم بەکار نەهێناوە.

١٣-من کرداری ڕابوردووم بەکارهێناوە.